کۆڤارێکی
بواری
پەرەپێدانی
مرۆیی گشتییە
شوباتی
2013

# بەرەو 9

منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

## غلۆربوونەوە!

## کە تۆ کۆیلەی پارە بیت
## ئازادنیت!

## خانمان ئەمەیە ڕۆمانسیەت!

## ئایا تۆ بە هیـــوای
## هاوســەرگیریت یان نا؟

## وێستگەکانی
## بەخۆداچوونەوە



## وەرە دەرەوە لە
## ناخی خۆت

## گرفتی دڵەڕاوکێ، لای
## ئەو خوێندکارانەی
## تازە دەچنە زانکۆ

## 10
## دەروازەکانی سەرکەوتن

## هاوسەنگی لە گەمەی سێرك ئەستەم ترە!

# بره‌و

گۆڤارێکی بواری پەرەپێدانی مرۆیی گشتییە

ژمارە (9) شوباتی 2013





٣



٢٨



٦



٣٢



٩



٤٢



١٦



٤٦



٢٣


راوێژکاران

شەماڵ موفتی    د.کەریم ئەحمەد

د.سادق عەزیز خۆشناو    د. ئەحمەد وەرتی

خاوەنی ئیمتیاز

نەوزاد سەلام خۆشناو

٠٧٥٠٤٥٣٢٢٢٤

khoshnaw_n@yahoo.com

سەرنووسەر

یاسین ئەحمەد زەنگەنە

٠٧٧٠١٤٨٨٩٦٢ - ٠٧٥٠٤٣٣٨٥٨٧

yaseenzangana@yahoo.com

بەڕێوەبەری نوسین

عەلی ئیبراهیم حەسەن

دەستەی نوسەران

ئومێد مستەفا

ئیحسان برهان الدین

ئەمیر ئەحمەد عەبدولقادر

نیمان ناصح

بەشی ریکلام

٠٧٥٠٤٢٠٠٦٥٦

تایپێست

هاوڕێ یاسین

ناردنی بابەت و پەیوەندییەکان لەڕێگای سەرنوسەرەوە دەبێت.

نرخی 2500 دینارە

دیزاین گۆڤاری بڕیار

هەولێر- شەقامی نیسکان بەرامبەر ڕاین مۆڵ

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## دەستپێك

سەرنووسەر

# هاوسەنگی لە گەمەی سێرك ئەستەم ترە !!!



– زۆرجار لێرەو لەوێ وتار و نوسین و گۆشەنیگا دەربارەی راگرتنی هاوسەنگی لە ژیاندا دەخوێنینەوە، و هەر یەك لە روانگەی دیدوبۆچونی خۆیەوە تاوتوێی دەكات و خاڵ ریز دەكات، هی وایان هەیە هێندە تیۆرییە خاوەنەكەشی ناتوانێت لە ژیانی خۆیدا پراكتیزەی بكات، ئەمەش بێگومان بێ هۆ نیە، راگرتنی هاوسەنگی وە نەبێ كارێكی ئاسان بێ، مرۆڤ بە سانایی پیادەی بكات، هاوسەنگی هەوڵ و كۆشش و هزرو ژیری و زاڵبوون بەسەر خوددا دەخوازێت. دەكرێت بڵێین:راگرتنی هاوسەنگی وەك تێپەڕبوون یان راكردن بەسەر گوریسی یاری سێركدا وایە، ئەمەش تواناو مەهارات و لێهاتوویی دەوێت.

– مرۆڤەكان بە زۆری لەنێوان زێدەڕۆیی و بەفیرۆداندان، زێدەڕۆیی لەبوارێكی ژیان و كەمتەرخەمی لە بوارەكانی تردا. بۆیە دەبینین دەرەنجام هەست بەخۆشی و چێژ و شادومانی ناكەن و جگە لە حەسرەت و ماندووبوون هیچی تر نادورنەوە.

– هەموو مرۆڤێكی نۆرماڵ ئەم پێداویستسانەی هەیە وەك: ژیانی پیشەیی و بژێوی ژیان، لایەنی رۆحی و پەرستش، ژیانی خێزانی و كۆمەڵایەتی، پشوو و حەوانەوە، وەرزش و حەزو خولیای هونەری، رۆشنبیری....تاد، پێویستە بۆ هەریەكەیان كاتی گونجاو تەرخان بكات و هێندەی خۆی بایەخی پێ بدات.

– بۆ نموونە هەركات توانیمان ئەركەكانی ئەورۆژەمان بەتەواوی جێبەجێ كرد، ئەوا لەناخەوە هەست بەخۆشی و حەسانەوەو ئارامی دەكەین، گەیشتن بەم هەستە لە راپەراندنی كاروباردا كارێكی وا ئاسان نیە، بەڵكو پابەند بوون بەرێكخستنی كات و هاوسەنگی دەخوازێت.

– كەسانی وا هەیە لەكارو كاسبی پارەپەیداكردندا سەركەوتنی باشی بۆ خۆی تۆمار كردووە و ماڵ و سامانێكی وای كۆكردۆتەوە رەنگە بەچەند نەوەیەكی دوای خۆی تەواو نەبێت، بەڵام دەبینین لە رووی خێزانی و پەروەردەی منداڵ و بارەكانی تردا حاڵی شڕو وێرانە و كەس خۆزگەی پێ ناخوازێت، لەناو چەندین قەیراندایە و تەنانەت چێژ لە ماڵ و سامانەكەشی وەرناگرێت تووشی چەندین نەخۆشی درێژخایەن بۆتەوە، مەپرسە كەس بەحاڵی نەبێت.

هەركات نەمانتوانی هاوسەنگی بپارێزین و لەبوارێكدا رۆچووین لەسەر حیسابی بوارەكانی تر، ئەوا بێگومان دەبێت باجەكەی بدەین و زۆرجاریش باجەكان هێندە نرخیان قورسە ژیانمان پەشێوو شپرزو ناسۆر دەكات.

# گرفتی دڵەڕاوکێ، لای ئەو خوێندکارانەی تازە دەچنە زانکۆ

بوونی بڕێك لە دڵە ڕاوکێ شتێکی ئاسییە لە هەر مرۆڤێکدا،گۆڕینی ژینگەو شوێنی کار،یان نیشتە جێبوون، هۆکاری ئاسا یی و ڕارایین و فشار بۆ دەروونی مرۆڤ دروست دەکەن، چونکە مرۆڤ کەمترین زانیاری و ئەزموونی لەم ژینگە نوێیانە هەیە، وەك بەشی ناوخۆیی و،بوونی هاوڕێی تازە لەم بەشە ناوخۆییانە،یان لە کۆلێژ،،مامەلە کردن لەگەڵ کەسی نوێ، کەسایەتی نوێ، بیرو بۆچونی نوێ، ژیانی کۆمەڵایەتی نوێ، فشاری خوێندن،ڕێکخستنەوەی لایەنی ئاتر بوری،بیر کردنەوە لە دوارۆژ،نمرە هێنان،ئەمانە هەموویان دەینە هۆی ڕارایی و فشار دروست کردن لەمانەش زیاتر بۆ یەکەمجار دوورکەوتنەوە لە ماڵ و هەلگرتنی بەر پرسیارییەتی نوێ بەبێ پاڵپشتی ئەندامانی خێزان، دڵەڕاوکێ و فشارەکە زیاتر دەکات.

ئەم فشارو دڵەڕاوکییانە لە زۆر بەی خوێندکاران هەیە و بە شتێکی ئاسایی دادەنرێت، چونکە دوای ماوەیەك بزر دەبن و خوێند کارەکە دەگەڕێتەوە دۆخی ئاسایی جارانی، بەڵام ئەگەر ئەم حاڵەتە بەردەوام بوون،ئەوا دەبنە گرفتی دڵە ڕاوکێ. بەتایبەت لەو خوێندکارانەی بەر چوونە زانکۆ گرفتی دڵە ڕاوکێیان هەبووە.

بۆیە زوو ناسینەوەی ئەم حاڵەتانەو



د. ڕێدار محمد امین
پسپۆری نەخۆشیە دەروونیەکان

یارمەتی دانی خوێندکاران هەنگاویکی گرنگە، ئەوەی جێگای داخە هیچ پشکنین و هەڵسەنگاندنێکی دەروونی بۆ ئەم خوێندکارانە ناکرێ لە کاتێکدا زۆربەی خوێندکاران نازانن چۆن مامەڵە لەگەڵ فشارو دڵەڕاوکێ بکەن،چو ڕاوکێ بکەننکە بە درێژای ١٢ساڵی خوێندن ئەلف و بێ ی سایکۆلۆژیاشیان نەخوێندووە.

بۆیە زور گرنگە هەر یەك لە خوێندکارەکە، مامۆستایان، خێزانی خوێندکارەکە شارەزایی تەواو لە سەر نیشانەو گرفتەکانی دڵە ڕاوکێ پەیدا بکەن، تاکو بەزووترین کات ئەم گرفتانە بناسنەوە و ڕەوانەی لای پزیشکی دەروونی بکەن چونکە لە کاتی بوونی ئەم هەموو گۆرانکاریە کتوپر و نوێیەو بوونی دڵە ڕاوکێ و ڕارایی زور، کاریگەری زوری لەسەر توانای ئەقڵی و جەستەیی جێ دەهێڵێت.

## دڵە ڕاوکێ چیە ؟

هەر ڕۆژێك تاقی کردنەوەم هەبێت، زۆر توشی دڵە ڕاوکی دەبم ئۆقرەم لێ دەبڕێت خواردن و میزاجم تێك دەچێت، ئەو شەوە ناخەوم یان کەمێك دەخەوم کە تاقیکردنەوەکە تەواو بوو، منیش چاك دەبمەوە، بەڵام ماوەیەکە دوای تاقی کردنەوەش دڵە ڕاوکێم هەیە.

ناوە ناوە، بەبێ بیر کردنەوە لە هیچ ترس یان گرفتێك توشی دڵە کوتان دەبم، لەگەڵدا هەناسەم سوار دەبێت هەندێك جار وادەزانم دەخنکێم، ئەم حاڵەتە زیاتر لە ١٠ خولەك دەخایەنێت و دوایی دەگەڕێمەوە دۆخی جارانم.

هەمیشە هەستم بە ناڕەحەتی دەکرد، لە گەدەدا، هەستم دەکرد ڕیخۆڵەکانم پرن لە گاز، هەمیشە ترسێك باڵی بە سەردا کێشاوم، نەم دەزانی سەرچاوەی ئەم ترسە چیە ؟ من هەموو شتێکم بەرەش یان سپی دەبینیلەزۆربەی حاڵەتەکانیشدا تەنها ردبە ڕەش دەمبینی.

ئەم نامیلکەبە هەوڵێکە بۆ ناساندنی دڵەراوکێ، هۆکارەکانی،کاریگەریەکانی و چی بکەین بۆ ئەوەی دڵە ڕاوکێ کەم بکەینەوە،لە هەمان کاتداهەوڵێکە بۆ دڵدانەوەی هاورێ و خزم و کەس لەبارەی ئەم گرفتە

## دڵە ڕاوکێ چیە؟

بریتی یە لە حاڵەتیکی ڕاڕایی و ترس، لە داهاتودا،جا ئەم داهاتوە نزیك یان دوور بێت لە کاتێك نازانین چ ڕوو دەدات،هەر یەك لە ئێمە ناوە ناوە توشی دڵە ڕاوکێ دەبێت، زۆر خەڵك باس لە ڕاڕای،گرژ، نائارامی و ترس دەکەن لەکاتی تاقیکردنەوە، چوون بۆ نەخۆشخانە،ئەنجامدانی چاوپێکەوتنی تەلەفزیۆنی،یان دەست پێکردنی کارێکی نوێ،تۆ ڕەنگە هەست بە ناڕەحەتی بکەیت و ترس لەوە هەبێت لەم کارە سەرنەکەویت، بەم شێوەیەش ئەم ڕاڕایە کاریگەری لەسەر خەو، خواردن،و توانایی تەرکیز کردن هەیە. ئەگەر هەموو شتەکان باش بوون دڵە ڕاوکێ نامێنێت. دڵە ڕاوکێ ی کاتی یان بڕی کەم لەو دڵەڕاوکێ یە بۆ مرۆڤ بەسودە، چونکە هانت دەدات بخوێنیت، کارەکە بە جوانی بکەیت، بەڵام ئەگەر دڵەڕاوکێ یەکە لە حاڵەتی خۆی زیاتر بوو،ئەوا کاریگەری لەسەر کار و چالاکی و بیر کردنەوەت دەبێت.

## لەبەر چی هەندێك خەڵك لەهەندێکی تر زیاتر توشی دڵە ڕاوکی دەبن؟

زۆر فاکتەر هەن دەبنە هۆی سەرهەڵدانی دڵەڕاوکێ،ڕەنگە شتێکی ناخۆش لە ڕابردوو ڕوویدابیت،وئەو وەختە تۆ نەتوانیت وەك پێویست مامەڵەی لەگەل بکەیت،بۆیە ئێستا دڵەڕاوکێت هەیە،چونکە هەمان حاڵەت هەیەو دیسان نازانیت چۆن مامەڵەی لەگەڵبکەیت،بۆیە دیسان توشی ڕاڕایی و دڵە ڕاوکێ دەبیت. لەوانەیە ڕاڕاییت هەبێت لە بارەی دوا ڕۆژدا هەندێك جار ئەگەر ئێمە هەست بکەین کەوا ناتوانین کۆنترۆڵی هەندێك لایەنی ژیانمان بکەین، ئەوا توشی دڵە ڕاوکێ دەبین، بەتایبەت بیر لەو شتانە دەکەینەوە کەوا لەدەرەوەی کۆنترۆڵی ئێمەدان وەك بۆ نموونە؛

ترس لە توش بوون بە جەڵتەی دڵ.شیرپەنجە،لەدەست دانی کار،تەنانەت هەندێك جار دڵەڕاوکێیەکەمان گەورەتر دەبیت و ترسمان لە تەقینەوەی بۆمبی ناوەکی .بوومەلەرزە .لافاو .....هتد دەبێت

هەندیك جار بەهۆی شێوازی پەروەردەکردنەوە مرۆڤ توشی دڵە ڕاوکێ دەبێت وەك ستایلێکی ژیانی لێ دێت، لەوانەیە ئەندامانی خێزانەکەت بە گشتی ژیان بە شوێنێکی پر مەترسی ببینن

بۆماوە، مامەڵەی ڕۆژانە،فشاری ژیان،کەسایەتی،پەروەردەی خێزان، ئەمانەهەموویان کاریگەریان لەسەر دروست بوونی دڵە ڕاوکێ هەیە.

جگە لەمانە بەبەردەوام خواردن و خواردنەوەی، چا، قاوەشەکری زۆر،خواردنی خراپ، بەکارهێنانی ماددەی هۆشبەر ماندوو بوون، فشاری ژیان، زیانی لاوەکی هەندێك دەرمان، هەمووی دەبنە هۆی زیاد بوونی دڵەڕاوکێ

پاش ماوەیەك لە دڵەڕاوکێی ئاسایی، هەندێك هەندێك خەڵك دەست دکەن بەترس لە دڵە ڕاوکێ بەتایبەتی ترسی ئەوەی نەتوانن کۆنترۆڵی بکەن (ترس لە ترس)، بەم شێوەیەش لە بازنەیەکدا دەخولێنەوە،ئەوان توشی دڵە ڕاوکێ دەبن چونکە تر سیان لە نیشانەکانی دڵە ڕاوکێ هەیە.

## کاریگەرییەکانی دڵە ڕاوکێ چین؟

دڵە ڕاوکێ کاریگەری لەسەر هەریەك لە جەستەو دەروون هەیە

## کاریگەرییە جەستەییەکان

زیاد گرژبوونی ماسولکوکان دەبنە هۆی ماندوو شەکەت بوون،هەناسەدانی خێرا دەبنە هۆی ئەوەی کەسەکە هەست بە گێژبوون،سەر سووورڕان و لەرزین بکات و هەندێکجاریش باسی لە ژانە سەرێك دەکات لە شێوەی دەرزی ئاژنین،زیاد بوونی فشاری خوێن وای لێ دەکات زیاتر هەست بە لێدانی دڵ بکات، بەهۆی گۆڕانی خوێن لە کۆئەندامی هەرس هەست هێڵێنج هاتن دەکات و لەوانەیە بڕشێتەوە،گرژبوونی کۆئەندامی دەمار وای لێدەکات زوو زوو بچێتە ئاودەست بۆ میزکردن و هەست بە ناڕەحەتی بکات لە سکیدا.

## کاریگەرییە دەروونییەکان

بریتین لە ترس،هۆشیاری زۆر،ئۆقرە نەگرتن و ئارام نەگرتن، ڕەنگە حەزێکی زۆرت هەبیت خەڵکانی تر دڵت بدەنەوە و پشت بەوان ببەستی.

شێوازی بیر کردنەوە ت دەگۆڕێت،و هەموو شت بە ڕەش بینی دەبینی و پێت وایە هەموو شتێك بەرەو خراپی دەڕوات،بۆ نموونە کاتێك لە چاوەڕوانی هاورێیەکت دایت و ئەو دواکەوتووە، تۆ ترسی ئەوەت هەیە توشی ڕووداوبووە،یان هەر نایەویچت بتبینێت، بەڵام لە ڕاستیداهیچیان نیەو ئۆتومبیلەکەی دواکەوتووە.



ناظم عبدالله

ئەڵقەی دووەم

# هۆکارەکانی جوانی لە بەهەشتدا

لە ڕوە مادیەکەشەوە خوای گەورە بە شێوەیەك مرۆڤی دروست کردوە، کە هیچ دروستکراوێکی هاوشێوەی مرۆڤی دروست نەکردوە، وەکو خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ ﴾التغابن:٣ یان ئەفەرموێ: ﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾ التين:٤

هەروەکو پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەفەرموێت لە شەوی میعراج دا یوسف پێغەمبەرم بینی (درودی خوای لە سەر بێت): (أعطي يوسف (عليه السلام) شطر الحسن) مسلم

گێڕاویەتیەوە، وە ئەم شێوە جوانیە مادیە مرۆڤە کان بە ڕێژەیەك مرۆڤ دەستی لە ناشیرین کردنیدا هەیە وەکو خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ الَّذِي عَمِلُوا لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾ ﴾ الروم: ٤١

کە بەشێك لەو (فساد)ە پیس بونی ژینگەیەو بە هۆی مرۆڤەوە ئەنجام ئەدرێت کە بە هەموشێوەیەك کاریگەری لە سەر مرۆڤەکان جێ هێشتوە، خوای گەورە ئەم بونەوەرەی وا دروست کردوە هەموی تەواو کەری یەکترن، بۆیە مرۆڤەکان هەرچەند بیانەوێت جوانی خۆیان پیشان بدەن، ناتوانن جوانی ڕاستەقینەی خۆیان بگێڕنەوە چونکە بەشێکی پەیوەندی بە ژینگەو تایبەت مەندی سروشتی زەویە وە هەیە، تا مرۆڤ لەسەر زەوی بێت جوانیە مادیە تەواوەتیە کەی پێ ناگەڕێنرێتەوە، بەو شێوەیەی کە خوای گەورە لە بهەشتدا دروستی کردوە،بەشێکیشی تایبەتە بە سروشتی بەهەشتەوە کە دروست کراوەکانی ژینگەی بەهەشت بە گیان دارو بێ گیانەوە هاوشێوەی دونیا نیە، بەڵکو لەجوانی وبارستایی وجموجوڵ وخواردن و ئارەزوە مرۆییەکان زۆر جیاوازە لەوانەی لە دونیادا هەیە،بەڵکوهەر ناوەکانیان وەك یەکن .

٣.٢بالای ئادەم (درودی خوای لەسەر بێت) شەست گەز بووە، و تا ئێستا مرۆڤ بچوك ئەبێتەوە.

لە کۆیی ئەم ئایەت و فەرمودانە دا ئەگەینە ئەو ئەنجامەی هەموو ئەو جوانی وتێروتەسەلی لە بالاو تەمەن درێژییەی کە مرۆڤ لەسەرەتاوە هەی بووە تایبەتە بەکەش وهەوایەکەوە کەلە سەرەتاوە مرۆڤ تێیدا ژیاوە، ژینگە پاکی هۆکاری تەمەن درێژی و ئەو هەمو مواصەفاتە بەرزانەیە،وەژینگە پیسی وکەش وهەوای خراپیش سەرەکی ترین هۆکاری تەمەن کورتیە،بۆیە ئەگەر مرۆڤ بیەوێت تەمەنی درێژ بێت،پێویستە بە خەمی کەش وهەوایەکی پاك ولەبارو گونجاوەوەبێت، وە ئەو ژینگە نا تەندروستەی لە ئێستا دا مرۆڤ تیایدا ئەژیت، سەرەکی ترین هۆکاری تەمەن کورتیە، ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم)وەکو موعجیزەیەك، جگە لە ڕاهاتنی مرۆڤ لەگەڵ ژینگەی زەویدا کە وەکو ژینگەی بهەشت نیە،هەواڵی ژینگە پیسی زەمەنەکانی دوایی ئەدات کە ئەفەر موێت: (ولا يزال الخلق ينقص حتى الآن) ئادەم (سەلامی خوای لەسەر بێت) تا لە بەهەشت دایە باڵا گەورەو دیمەن جوانە، کاتێك دێتە سەر زەوی کەم کەم نەوەکانی بچوك ئەبنەوەو شێوازیان ئەگۆڕێت، بەڵام کاتێك مرۆڤەکان ئەچنەوە بەهەشت ئەچنەوە سەر شێوەی قۆناغی یەکەم کە باوکە ئادە میانی لە سەر بووە، ئەگەر بەنمونە خەڵکی وڵاتانی ئەسکندنافی وئەڵمان ویۆنان بەرانبەر بکەین بەخەڵکی هەندێك لە وڵاتانی وەکو ئەفریقیا و، ئاسیای ناوەڕاست و،هیندستان، بە هۆیی جیاوازی ژینگەکەیانە وە جیاوازیان هەیە، مەبە ستم ئەوە نیە مرۆڤ ئەتوانێت زەوی وەکو بەهەشت لێ بکات، چونکە زەوی هەندێك صیفەت و تایبەتی مەندی خۆی هەیە هەرچیەکی لێ بکەیت لە وەصفی زەوی بونی دەر ناچێت، بەڵام هەر ئەم زەویە نەبووە کە مرۆڤە کان لە سەری تەندروستی وتەمەنێکی درێژیان هەبوە بەتایبەتی لە سەردەمی نوح (درودی خوای لە سەربێت)؟.

بەڵام ئەبێ ئەوە بسەلمێنین کە خوای گەورە چۆن ژیانی دونیای بە ئەسباب سازاندوەو ﴿ وَآتَيْنَاهُ مِن كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا ﴿٨٤﴾ ﴾ الكهف: ٨٤

بەهەمان شێوە ئەگەر لە ئایەتە کانی قورئانی پیرۆزو فەرمودەکانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وورد ببینەوە ئەبینین خۆشی و ژینگە جوانی بەهەشتی بە هەمان شێوە بە هۆکار دروستی کردوە، وە جۆری کەش وهەواکەی جوانی بە دانیشتوانی بهەشت و بەهەشتیەکان بەخشیوە، سوننەتی خوای گەورە وانیە لە بیاباندا گووڵ و گوێز بڕوێنێت و، خورما لە کوێستان! ئێمە لە گەڵ سروشتی زەویدا را هاتوین هەر بێنج هەستەکەمان لەگەڵ زەویدا مامەڵە ئەکات لە پشتی ئەوەوە هیچی تر نازانین، بۆیە ئەگەر تەماشای قورئان وفەرمودەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بکەین ئەبینین کۆمەڵێك زانیاری سەرەتاییمان ئەداتێ تا وەکو لە چوار چێوەی وێنەکێشانی ئەم زەوی و بونەوەرە (التصوير الكوني) بچینە دەرەوە، کە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ الْأَرْضُ غَيْرَ

ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ إبراهيم: ٤٨ لە تە فسيرى (التحرير والتنوير) دا هاتوە: گۆڕانکاری لە زەوی و ئاسمانەکاندا بە جۆرێکە یان بە گۆڕینی شێوەو صیفەتی ئاسمانەکان وزەوی ئەبێت،یان بە گۆڕینی خودو زاتی زەوی وئاسمانەکان ئەبێت خوای گەورە ئاسمان وزەوییەکی تر دا ئەنێت ئێمە حەقیقەتەکەی نازانین خوا خۆی ئەیزانێت، ئـەوەی لەم ئایەتە پیرۆزە وەری ئەگرین ئەوەیە:ئێمە لە رۆژی دواییدا لەم سروشتە مادیەزە مینیەی ئێستا ئەچینە دەرەوە بۆ سروشتێکی تر ئێمە ڕاستیەکەی نازانین و، لە بەر ئەوەش نەمان بینیوە ناتوانین وێناشی بکەین تەنها ئەوەندە نەبێت کە خوای گەورە بۆمانی وەصف کردوە، بۆ نمونەلە کاتی خۆر گیراندا لە ئیبنو عباسەوە ئەگێڕنەوە(خوا لێیان رازی بێت) هاوەڵەکان پرسیاریان لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کردو وتیان: (رايناك تناولت شيئا فى مقامك ثم رايناك تكعكعت فقال انى رايت الجنة فتناولت عنقودا ولو اصبته لاكلتم منه ما بقيت الدنيا) بوخاري ومسلم

واتە :وتیان ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بینیمان دستت بـردو گێراتەوە؟پێغەمبەریش فەرموی: بەهەشتم بینی دەستم برد بۆ بۆڵێك ترێ ئەگەر بم توانیایە لێی بکەمەوە تادونیا مابا لێتان ئە خواردو کۆتایی ناهات.

یەکێکی تـر لـە هـۆکـارەکـانـی جوانی بهەشت ئەوەیە: لە بەهەشتدا ئیرادەی خراپە نامێنێت قەدە غەکراوەکان هەڵ ئەگیرێن: ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِى صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ إِخْوَٰنًا عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٤٧﴾﴾ الحجر: ٤٧، تەنها لـەوی پلەو تایبەبەت مەندی هەیە، وە لەبەر ئەوەی لە بەهەشت دا حەقیقەتی ڕەها حەکەمە یاسا ورێنماییەکان سەبارەت بە چۆنیەتی پەیوەندی نێوان بەهەشتیەکان و تە جاوز نەکردنە سەر یەکترو تێکنەدانی یاساکانی ژیـان و بـونـەوەر نامێنێت، چونکە مرۆڤ لەوێ تەنها ئیرادەی خێری هەیەو ئیرادەی شەڕلە دڵی مرۆڤە کان دەر ئەکرێت.

گۆڕینی دیمەنی ڕۆژی دوایی وگۆڕانکاری خەڵك ودانیشتوانەکەی تەنها تایبەت نیە بە بەهەشت وبەهەشتیەکانەوە، بەڵکو بە هەمان شێوە دۆزەخ ودۆزەخیەکان بەدیوە ناخۆش وخراپەکەیدا گۆڕانی بە سەردادێت، کە ئەبێ لە بابەتێکی سەر بەخۆدا باسی لێوە بکرێت.



# چەند ئامۆژگارییەك بۆ چاککردنی جۆری ژیانمان!

**شەماڵ موفتی**

١- پەیوەندیت لەگەڵ ئاسماندا چاك بکە، چونکە تاکە ڕێگایە بۆ دڵنیایی و ئاسایشی ڕاستە قینەی ناخی مرۆڤ (دەرون و مێشك).

٢- بیرکردنەوە لە ئەرکەکانت، وە چۆن بڕیاری جێبەجێکردنیان دەدەیت، (واتا پلاندانان).

٣- پێنج تا دە خولەك تەرخان بکە بۆ ئاواتەکانت (بیانکە بە لیست) و بیرکەرەوە چۆن هەنگاویان بۆ بنێیت و پلانی درێژخایەنیان بۆ بکێشیت.

٤-هەوڵ بدە ڕۆژانە (کارێك ئەنجام بدە کە پێت خۆشە بیکەیت. (شتێکی زەق و دیار بێت و بەکەڵك بێت چ بۆخۆت و چ بۆ خەڵك).

٥- هەوڵ بدە بە خەندە و ڕوخۆش بیت.

٦-هەمو ڕۆژێك هەوڵی فێربونی شتێکی بەسودی نوێ بدە.

٧- هەربیرۆکەیەکت لا پەسەند بو و حەزت کرد بڵاوی کەیتەوە، بڵاوی مەکەرەوە تا دایەلۆگ نەکەیت لەگەڵ کەسێك یان کەسانێکی پسپۆڕ لەو بوارەدا، تا زانیاریت زۆرتر بێت و بتوانی قەناعەت بەخەڵکی بکەیت.

٨- پیاسە بکە و هە ناسەی قووڵ بدە و دورکـەوەرەوە لە ڕۆتین و کۆمپیوتەر و مۆبایل بۆ ماوەی نیو سەعاتێك.

٩ - بیرت نەچێ کە بۆ ماوەی ٢٠خولەك بچیتە ژێر خۆرەتاو، تا ڤیتامین (دی) لە لەشتدا دروست بێت کە زەرورە بۆ هەموو تەمەنەکان. ( ٤٩ ڕۆژی هەور یەکسانە بە تەنها کاژێرێکی بەر هەتاو لە بەخشینی ڤیتامین دی دا)

١٠- هەر بیرۆکە و خەیاڵێك نارەحەتت دەکا فەرامۆشی بکە، ئەگینا جۆری ژیانی ئەو ڕۆژەت دادەبەزێ.



حەمەی ئەحمەد ڕەسوڵ

# کە تۆ کۆیلەی پارە بیت، ئازادنیت!

کۆیلەبوون بۆ پارە، مەبەست لە هەموو ئەو بیرکردنەوەو ڕەفتارە ناشـــرینانەیە کە وا ئەکات مرۆڤـ برای خۆی لەخشتەبەرێت و بیچەوســێنێتەوە، تەنها بــۆ بەرژەوەندی تایبەتــی خۆی بەکاری بێنێ، پارەپەرســت وا هەســتدەکات کە ئیدی ئەمرۆ ســبەینێی بــەدوادا نایــەت و ژیــان هــەر ئەمرۆیــە ومردنیــش نایەتە ڕێگای، پــارەش هەموو شتێکە وئاسودەیی بۆ مەیسەر دەکات و هیچ ئازارێك لە جەســتەدا ناهێلێت! ئیشــکردن و بژێــو پەیداکردن جوانترین خەســڵەتی مرۆڤــن، هەموومــان بــە خەباتکــردن لە قەڵەمــی دەدەیــن و کــێ هەیە ئیشــکردن بەکارێکی خــراپ بزانێ؟ هیچ کۆمەڵگایەك نییــە تاکەکانــی خــۆی هانبــدات کــەکار نەکــردن بکەنە دروشــمی خۆیــان.. بەڵام لەمــڕۆژگارەدا گرنگتریــن بابــەت و بڕواو مەســەلەیەك کە تامەزرۆو چەشەو برەوی هەبێت باسی پارەو ســەیارەو تەلارە، باسی قازانجکردنی دەفتەرو بلۆکە دۆلارە، باســی پارچــە زەوی و دۆنــم وباڵەخانەوکۆشــك دروســتکردن و کڕیــن و فرۆشــتنییانە، باســی قازانجکردنــە لــە قوماربردنەوەدا، باســی بازرگانی وکەلوپەل هێنانە لە چین و ماچینــەوە، باســی کۆکردنەوەی ســەفتە دینــارو دۆلارە لــەو سەوداســەرییانەداکە هیچ کەســێك بەختەوەری سەد دەر سەدی لێــوە نەچنیووەتەوەو بەهەشــتی بێکۆتای نەدیووە.

گومانی تێدا نیە کە ژیانی زۆرینەمان و زۆرترین کاتمان بۆ پارە تەرخانکردوە،پارە وێــردی ســەر زمانــی ڕێژەیەکــی زۆرە لە خەڵکــی، بێگومان ئــەم دیاردەیەش هەروا لەخۆڕا دروســتنەبوە،هۆکارگەلێك لەپشــت ئــەم بارودۆخەوە وەســتاون: پێداویســتی ناومــاڵ زۆرتربون،چونکــە قەناعەتمان بە ژیانی سادە نەماوە، بازرگانەکانیش بازاڕیان بــۆ پڕکروین لــەکاڵاو شــتومەك وئامێری کارەبایی، بۆیە هەڵپەمانەو دەمانەوێ ماڵمان لەماڵی براکانمــان جوانتر وجەرگبڕتر بێ، هەروەها لەگەڵ باوانمــان ناگوزەرێین،بۆیە نیشــتەجێبون بۆتــە گرفــت وکرێــی خانــوو لایەکــی موچەمــان دەبات،کارەباو ئــاو وســوتەمەنی قڕیــان تێکەوتــوەو بەپارەن، ســەیارەش بۆتە کێشــە وخەرجی وسەرئێشــەی زۆری هەیە، هەروەها جگەرە و مەیخواردنەوەشــمان بەپارەن، پۆشــاك و جلوبەرگ وماکیاج کڕینمــان لەوپەڕیدایە، مۆبایلەکانمــان جمەیان دێــت، هەمووومان کرێچــی ئاســیاو ســاناو کۆڕەکین،ئەوانیش چاویان زەقەی دێ بۆ پارە.. ئێمەش ناتوانین دەســتبەرداری هیچکام لەو پێداویســتیانە بین، بۆیە گرانی گەیشتۆتە چاڵی چاومان.. ئیدی بۆ دابینکردنی ئەمانەو زۆریتریش لە پێداویستی، چۆن پارە نابێتە قیبلەنوومای هەموو لایەکمان؟!

ئەم حاڵەتــەش زەنگێکــی خەتەرناکە، هزر وباوەڕو ڕەوشــتی مــرۆڤ بە ئاقارێکی هەڵدێردا ئەبەن، چونکە هەموو شــتێك لە پێنــاوی پــارەدا ئەگۆڕدرێتــەوە ولەلایەکی دیکەوە مرۆڤ قەناعەتی نامێنێ و نەوەکانی دوای خــۆی بەو ســتایلە مەســرەفگەراییە ڕادێنــێ کــە ژیانیــش تەنهــا بــە پــارە مەیســەربکرێت ئیدی وشــە و بیروباوەڕ و بگرە مرۆڤیش هیــچ هێزێکیان نامێنێت و ڕەونەق لە هیواو ئاواتەکاندا ناهێڵێت، ئامانج

تەنها پارە کۆکردنەوە دەبێ و ژیان ئەبێتە غاردان بەدوای پارەدا، مانای بەختەوەری و ژیانی ڕاستەقینەو ئاواتی مەزن، ئەبنە کۆکردنەوەی سامان و ڕیزکردنی ڕیزە دوکان و دۆنمە زەوی و کۆشك و سەیارەو وەچنگکەوتنی ژنی شۆخ و نازدار.. ئیتر خەڵکی نەداریش پەتای لاساییکردنەوەو موڵك بەدەستهێنان دەیانگرێتەوەو دەکەونە هەڵپەکردنی بێوێنە بۆوەی بە وتەی خۆیان بگەنە لوتکەی بەختەوەری وخۆشی(کە بەداخەوە لە خەمی بێهودەو دڵەڕاوکێی بەردەوامدا دەژین وکامەران نابن!).

هۆکاری سەرەکی لە دەرکەوتنی ئەم دیاردە خراپەدا؛ ئازادکردن یان بەرەڵاکردن وگوێنەدانە بەبازاڕو گرانی نرخی شتومەك لەلایەن بازرگانە چاوچنۆکەکانمانەوە.. لەمبارەیەوە یەکسانی و دادپەروەریی کۆمەڵایەتی غایب و ونن! بەرپرسەکان پشکی شێریان بەرکەوتوەو ئابووری وڵات بە دەستی ئەوان دەگوزەرێت، موچەو موڵکی ئەوان هەر خوا دەزانێت چەندە! حاڵەتێکی پڕ لەئاژاوە دروستبوە،ێ ەوان زۆر هایلایف ئەژین، لە بورجی عاجیدان، خاوەنی هەموو شتێکن و زۆربەی خەڵکیش خاوەنی هیچ نین، ئەمە ئەو ترسەی لای خەڵکی دروستکردوە کە زوو فریا بکەون و شتێك بۆ ئەمڕۆو سبەی پەیدا بکەن و دڵنییابون و بۆ نەوەی داهاتویان مەیسەر بکەن.. داخی گرانم ئەم بارگرانی و زەحمەتی ژیانە پلەی ژێر سفری لە قەناعەت هێناوەتە بەرهەم و ئەم بارودۆخەش ماوەیەکی دیکەش ئەخایەنێت و ڕاوێژکاری ئێمەش هیچ سوودێکی ئەوتۆی نابێ، تەنها ئەوەندە نەبێت کە بڵێین قەناعەت زۆر گرنگەو لە ئامێرو کۆشك و تەلارو سەیارە بەسوودترەو ئاسودەییتان بۆ دەستەبەر ئەکات، چونکە هەتا ئامێر وشتومەکت زۆرتر بێت لەکاتی شکانیاندا خەفەتت زۆرترە، هەتا خەریکی سەیارەو مۆبایلەکەت زیاتر بیت،خۆشەویستیت بۆ مرۆڤ و بۆ ژیان کەمترو کاڵتر دەبێتەوە کە تۆ کۆیلەی پارە بیت، کۆیلەی باوك و هاوڕێ و ژنەکەشت دەبیت کە کۆیلەش بویت، لەنێو کۆشکی زێڕیشدا بژیت، تۆ شادمان نیت، چونکە تەنها مرۆڤی ئازاد بەختەوەرە.. مرۆڤی ئازادیش ڕازی نییە قەناعەت لەدەست بدات وکۆیلەی پارە بێت.



دایکی هاوڵان

# سۆزێك بۆ هاوسەرەکەم

وەرە ببە بە هاوەڵم، بە هاودەمم
وەرە ببە لەدایکبووی خەونێکی ئەرخەوانیم
وەرە ببە بە سەردێڕی پەیڤێکی نەنووسراوم
وەرە ببە هاوژیانم، بە هەتوانی زامەکانم
وەرە ببە بەخەندەو خۆشی بیژاکێنە خەمەکانم
وەرە ببە بە داهاتووم، بیسڕەوە ئەشکی ناسۆرم
وەرە ببە بە ئاوازێ، بیلاوێنە هەستەکانم
وەرە ببە بە دۆزەرەوەی خەونە ونبووەکانم
وەرە ببە بە ئارەزووم، بە ئومێدم، جوانتری بکە ژیانم
وەرە مەستم کە بەسۆزو میهری خۆت
وەرە ببە بەهێلانەی ئارامیم، تا دڵەی نەسرەوتم، وچانێك بدات و تاوێك تێیدا بنوێت، بە ئاسودەیی بەرەو کەناری بەختەوەری ملی ڕێگا بگرێت.



# غلۆربوونەوە!

د. هەلگورد فتح الله احمد ..... دكتۆراه لە پزیشكی هەناو ودڵ

كەبەرد لەسەر گردۆلكەیەك شۆڕدەبێتەوە نێوشیوێك، ژیانی جەنجاڵی كەسە پڕئیشەكانە.

ـ ڕۆڵە ببن بە پزیشك، ئەندازیار تاوەكو پارەی باشتان دەستكەوێ.

ئامۆژگاری كەسێكە بۆ مناڵەكانی كە ماددی بیر دەكاتەوەو باوەڕی بە بەها روحیەكان نیە.

ـ ئۆخەی خۆ كوڕە ی نۆبەرەم بووە ئەندازیاری تەلارساز بەڕاستی پارەی باشی دەست دەكەوێت.

ـ ئەلو.......هەلاو........ڕۆڵەكەم من باوكتم چەند جار تەلفۆنت بۆ دەكەم بۆ وەلام نادەیتەوە، بۆ نایەیت سەردانێكی دایكت بكەیت، بەردەوام لە دووری تۆ فرمێسك ئەبارێنێ، كوڕی شیرینم چۆن تۆ منالت هەیە جەرگی بابەن، تۆش جەرگی من ودایكتی،جەرگمان مەبڕە.

ئەرێ بەسە، بۆوازم لێناهێنن، من چیتان لێبكەم پێڕاناگەم، هەر ڕاكە ڕاكەمە، ئێستا بیست جێنزام (موعد) هەیە، چەندین پڕۆژەم لەبەردەستە، چیم داوە لە ئێوە سەرم ناپرژێتە سەر منالەكانم هەرگیز بەزیندویی نایانبینم، بەیانی دەردەچم نووستوون، شەوانە دێمەوە نووستوون،چ جای ئێوە،ناتوانم سەرتان لێبدەم.

ئۆخەی كورە چكۆلەكەم بووە پزیشك ڕۆلە باش ببینە چ پسپۆڕیەك پارەی باشی تیایە برۆ ئەوێ، زانستی و ئارەزوومەندی گرنگ نیە چۆن بەخۆم بۆ خۆت وبرات پزیشكی وئەندازیاریم هەلبژارد.

+پزیشكی چاوم ڕۆژانە چەند نەشتەرگەری ئەنجام دەدەم، بەزۆری لە نەخۆشخانەی تایبەت، بەڕاستی دەستكەوتم باشە ئای لەو كاسبیە باشە.

+نانا دەبێ بەشەكەم بگۆڕم، بەڕاستی ماندووم بەشی تر هەیە پارەی باشترو ماندووبوونی كەمتر.بۆچی خۆم ماندووكەم كێ منەتی پێیە. ئا ئا دەچمە جوانكاری پێست،بۆخۆم لێزەرێك دادەنێم دەیان كچ وپارەدار دێن جوانكاریان بكەم، ئەمڕۆ خەلك باری گوزەرانی باشە بەدوایی ڕووكەشەوەن.

+ نۆرینگەكەم بەرناكەوێ، باشتروایە سەنتەرێكی جوانكاری دابنێم، كڕیارم زۆربووە.

+ سەنتەرەكەم فراوانە بە تەنها پێڕاناگەم، پزیشكێكی یاریدەدەربێنم .....دووان .....سیان .....شەش وحەوت.هەروا فراوان دەبێ. جابۆ

لــە وڵاتێکی تریــش ســەنتەرێکی جوانکاری نەکەمەوە زۆربەی نەخۆشەکان لەوێوە دێن، بۆ ئەم ســەنتەرەمان،بچم گیرفانی ئەوانیش دۆشدادرم.

+ ئای کە خۆشــە پولم وەســەریەك نــاوە، هەموو ئامانجــی ژیانم ئەمە بوو، ئێســتا بەکەیفی خــۆم دەژیــم، نۆرەی خۆشــگوزەرانی و ڕابواردنە.ئۆتۆمبێلێکی فیــراری مۆدێل بەرز، ئەمــە بەس نیە، فۆردێکیشی ئەخەمە ســەر..... خانووێك دروســتکەم،خانووچی یــە کۆمەڵگایەك دروستدەکەم،لەخۆشنودترین شێوە، ڤێلا، باخچە پارك، مەلەوانگە ......

+ئۆخەی خۆشــە ئێســتا لێبوومەوە، ئەو هەموو خۆشڕابواردنە.

+ئۆی پشتم دێشــێ ئەمە چی یە ؟! پشکنینێ بکەم هەر باشە ......چی چی... ن ن.. نا نا.. نابێ ش..شــێرپەنجەی سی نــا. ن...قۆناغی چوارەم هەموو لەشــمی داگرتــووە، ئــێ خــۆ من گەنجــم خۆم پزیشکم......ئایی چی بکەم ؟نەشتەرگەری ناکرێم، بەدەرزی کیمیایی لاشــەم دارژا، لەسەر ســەرینی مەرگ ڕاکشاوم ملیۆنان دۆلارلە تەنیشتمە بۆمن بە فلسێك، گشت گیانم ئازارە، تەنیشتم وەك نەشتەر لەم پێخەفــە نەرمە ڕادەچــێ، نەبەرەبەیان ئەســتێرەی چاکبوونــم بۆهەڵدێنــێ، نەتاریکی شەو گیانم دەتاسێنێ.

کێ بێ ئەم گیانەم بەرێ لەم جیهانە هەر شــەکەتی بوو بەشم، وەم حەسێنێ، بێگومــان هەردەیبــات بەمزوانە،دوایــی لاڵانــەوەو دەردو ژان، نەپزیشــك ونەپزیشــکی نەداودەرمــان، نەپارەوپول دەهانایــی ژانم نایەن.......تۆبڵێی...... نا... هیچ.... .....مرررر...د...مرد.

- چەمکێکی سەیرە ڕاچەڵەکێنە، کوڕی چکۆڵــەم بــوو، هێشــتا گەنج، پزیشــکێکی پســپۆڕ، بەناوبانگ، پــارەدار، کۆتایی ژیانی هات، شــوێن پێــی جێنەما نەبــووە مایەی خۆشــنوودی دایــەو بابە دڵــی داغکردین. کەس هەریادیشــی ناکات، پارەکانی ئەمیان لەبیرچــوو، ئەویش تەنها برادەری پارەبوو، دۆست وکەسی تری نەبوو.

کوڕی گەورەشــم، گۆپاڵی دستی پیریم، گۆپاڵێکی شــکاوم دروســتکرد، بەریدامەوە، فڕێیدامە ســەرزەوی، هیچیانــم بۆ نەبوو. لەداروبــەردم پچکوڕیەوە تا ئــەم دووانەم پێگەیانــد، کەچــی شــەرپەنجەی پــارەو ســی کوشــتی،دووەم پــارە زینــدە بەچاڵی کردووە، وەکو بەردێك غلۆربێتەوە لەســەر تەپۆلکەیــەك ڕۆژ کورت ودرێژ، شەویشــی دەخاتە ســەر، ڕاکە ڕاکە ســوودی کەسیان نەبوو لەم جیهانە، تەنانەت خۆشیان چ جایی منێك ئاوە بــە ماددیەت پەروەردەم کردن، شــوێن پێی خۆم وخۆیان لەســەر سەهۆڵ هەڵکەند توایەوە، بەلمی بیابان نووســیان، بــەر با کــەوت وســڕایەوە، لە ســەر بەند هەڵیاننەکەنــد، مێژوو ناویــان تۆماربکات، مرۆڤایەتــی بۆمان بگری، بەنەمری یادمان بکەن، خۆم وکوڕی گەورەشــم بەچەشــنی پزیشــکی لاوی جوانە مــەرگ، بەزیندوێتی مردوویــن، بــێ کەڵك، گەنیوین، ســەیرکە زیندوین لەڕیزی مردووان.



# شوێنکەوتنی براوەکان

ئامادەکردنی: هیوا بلباس

لە سەرۆك وەزیرانی پێشووی مالیزیا (مەهاتیر محمد) یان پرسی چۆن ئەو بووژانەوەو بەرەوپێشچوونەت بۆ وڵاتەکەت داهێنا، لە ماوەیەکی پێوانەییداو چ ڕێگایەکت بەکارهێنا بۆ ئەم مەبەستە؟ ئەویش لە وەڵامدا وتی (تەنیا چاوتێبڕین و تۆمارکردن بوو، من تێنووسێکی بچووکم بەردەوام لەلابوو کاتێك بۆ هەر وڵاتێك دەچووم چ شتێك جێگای سەرنج و گرنگی پێدان بووایە لەلای خۆم بەتێبینی دەمنووسی، بۆنموونە کاتێك سەردانی سەنغافورە دەکەم و دەڵێن گەورەترین دووەم فرۆکەخانەی لەجیهاندا تێدایە ئەوا لەلای خۆم دەینووسم کە چۆن بنیاتیانناوە .. هەروەها کاتێك دەچووم بۆ یابان و وتیان گەورەترین دووەم کۆمپانیای دروستکردنی ئوتۆمبێلی هەیە تۆمارم دەکرد، ئەنجا گومانیشم لەوەدا نیە کە وڵاتەکەی من دەتوانێت گەورەترین فرۆکەخانەو چاکترین ڕێگاوبان و بەرزترین باڵەخانە (ناگحە سحاب) ی تێدابێت، هەرچەندە تائێستا نەگەیشتووین بە پلەیەك لە هەموو بوارێکدا بەڵام زۆریش لێی نزیك بووینەتەوە).

لەڕاستیدا ژیان کۆمەڵێك یاساوڕێسای جێگیری تێدایە کە بۆ هیچ کەسێك ناگۆڕێت، بۆیە ئەوانەی تامەزرۆن بۆ گەیشتن بە پایەی بەرزو لەو بوارەی کە ئارەزوویان تێداهەیە دەربکەون لەڕیزی پێشڕەو ونموونەجوانەکان ئەژمار بکرێن پێویستە لەسەریان یاساکانی سەرکەوتن وبردنەوە بەکاربهێنن وپێیەوە پابەندبن . بەم جۆرە شوێن پێهەڵگرتنی براوەکان و هەنگاونان لەسەر شاڕێی سەرکەوتووان هەمان ئەم دەرئەنجامانە دەدات بەدەستەوە. بۆیە پێویستە لەخۆمان بپرسین چۆن ئەمانە بوون بە ئەستێرە لە بوارە جیاجیاکاندا، ئەی چۆن فلانە کەس ئەم هەموو سەرکەوتنە یەك لەدوای یەکەی تۆمارکرد، لەبەرچی مێژوو ناوی ئەوانەی بەزیندوویی هێشتوەتەوە، ئەی بۆچی فلانەکەس بوو بە خۆشەویست و پێشەنگی خەڵك، لەکاتێکدا فلان وفیسار ناویان ناهێنرێت وباسیان ناکرێت و لەلایەن خەڵکەوە پەسند نین ؟!

جا هەر بەهۆی گرتنەبەری ئەم شێوازەو شوێنکەوتنی هەنگاوەکانی مرۆڤە سەرکەوتووەکان بوو کە چەندەها بلیمەت و هەڵکەوتووی تر هاتوونەتە سەر شانۆی ژیان و بەردەوامیش ئەم تەرزە مرۆڤە بەتواناو لێهاتووانە دروست دەبنەوەو دەچنەوە نێو کاروانی هاوشێوەکانی خۆیان.

لەنێو خەڵکدا کەسانێك هەن کە هەرگیز ناتوانن فێری شتەکان ببن و پەندو وانە لەوانەی پێش خۆیان وەربگرن تاخۆیان هەڵەکان دووبارە دەکەنەوەو تاڵیەکان دەچێژن، بەڵام لەهەمان کاتدا کەسانی تێگەیشتوو و هۆشیار هەردەم لە دەوروبەری خۆیان ورد دەبنەوەو وانەی پڕسوود وبەکەڵك لە ئەزموونی خەڵکانی تر وەردەگرن و ڕێگاکان کورت دەکەنەوەو تەنیا هەنگاوە ڕاست و دروستەکان دووبارە دەکەنەوە.

# ترسی کۆمەڵایەتی

ئاسۆس انور سلێمان
مامۆستای زانکۆ



دەستپێك:

ترسی کۆمەڵایەتی بە یەکێك لە تەنگژە دەروونیە بەربڵاوەکان دادەنرێت لە جیهاندا ، بەتایبەت لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، کە پەیوەندییەکی پتەوی بە کەلتوور و ئاستی هۆشیاری کۆمەڵگەوە هەیە، بەچەندین شێوە ناوی دێت، لەوانە شەرمی کۆمەڵایەتی ، دڵەڕاوکێ ، ترسی کۆمەڵایەتی..... هتد.

بوونی ئەم دیاردەیە قالبێکی ڕێژەیی وەرگرتووە لە کەسێك بۆ کەسێکی ترو لە کۆمەڵێك تا کۆمەڵێکی دیکە بە جیاواز دەردەکەوێت، بێگۆمان جیاوازی ڕێژەیی بوونی ئەم دیاردەیە لە مرۆڤدا هۆکاری تایبەتی خۆی هەیە، کە بەشێکی کەمی دەگەڕێتەوە بۆ هۆکاری بۆ ماوەیی، کەواتە ژینگەو دەوروبەر ڕۆڵی سەرەکی دروستبوونی ئەم دیاردەیەن و هاوکات دەشێ ببن بە چارەسەری شیاو بۆ نەهێشتنشی لەلای تاك (١).

بوونی ترسێکی کەم بەئاسایی وەردەگیرێت، چونکە یارمەتی مرۆڤ دەدات ئامادەباشی هەبێت لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەی خەڵك، بەڵام کێشە لەوەدایە کە ئەگەر ئەم جۆرە ترسە زیاد بکات و ببێتە مایەی پەکخستنی، چونکە مرۆڤ ڕاستە کائینێکی خاوەن ژیرییە، بەڵام ئەم ژیرییەی بەبێ هەوڵدان نرخێکی ئەوتۆی نابێت و ناتوانێت ببێتە مایەی دروستکردنی کەسایەتییەکی وا کە بڵێ من هەم وە من دەتوانم بگەم بە منی باڵاو نموونەیی، بۆیە پێویستە بڕیار بدەین و دەستەوەستان نەوەستین. مێژوو بۆمانی دەگێڕێتەوە کە پیاوێکی دانا لە وڵاتی یۆنان لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوەی خەڵکدا زمانی تەتەڵەی دەکرد، واتە نەیدەتوانی بە ڕەوانی قسەکانی بکات، بۆیە بڕیاریدا بچێت بۆ کەناری دەریا و بەتەنها بە دەنگێکی بەرز ڕاهێنان بکات بۆ ماوەیەکی زۆر، بەمشێوەیە بوو بە یەکێك لە ناودارترین وتاربێژەکانی یۆنان لەم سەردەمەدا.

ئەم ترسە کەی دەستپێدەکات؟

ترسان لە خەڵکانی غەریب هەر لە تەمەنی شەش مانگییەوە لەلای منداڵ دەستپێدەکات، کە ئەمە دیاردەیەکی بۆماوەییو غەریزی مرۆڤە و هەر لەم تەمەنەوە هەستی پێدەکاتو لەگەڵیدا گەشەدەکات، وە فێری ئەوە دەبێت چۆن مامەڵە لەگەڵ دەوروبەر بکات و خوێندنەوەی بۆیان هەبێت، بۆیە دەبینین هەر لەمنداڵییەوە دڵی بەکەسانێك خۆشەو دەچێتە لایان، لەکاتێکدا خۆی لە هەندێکی دیکە بەدوور دەگرێت و پێیان بێزاردەبێت، بێگومان گەشەسەندنی ئەم جۆرە ترسەش لەلای مرۆڤ بەندە بە تاقیکردنەوە نەرێنییەکانی ژیانی، لە مامەڵەکردنیدا لەگەڵ دەورووبەر و خودی ڕادەی هەستیاری خۆی ، کە هۆکارێکی گەورەی دروستبوونو زیادبوونی ئەم جۆرە ترسەن لەلای مرۆڤ و وا دەکات تێڕوانینی بەرامبەر دەوروبەر بگۆڕێت و نەرێنی بیر بکاتەوە (٢).

نیشانەکانی چیین؟

دەکرێ بەمشێوەیە سادەبکرێتەوە:

نیشانەی دڵەڕاوکێی جەستەیی و دەروونی + ترسان لە هەڵسەننگاندنی نەرێنی دەوروبەر سەبارەت بە خۆی و ڕەفتارەکانی + دورەپەرێزی = ترسی کۆمەڵایەتی.

نیشانەکانی دڵەڕاوکێی جەستەیی و دەروونی بریتین لە: زیادبوونی لێدانی دڵ (دڵەکوتە)، خێرا هەناسەدان و بەتایبەت هەناسەدانی ڕووکەشی، عارەقکردن، لەرزینی دەست و قاچ و تەنانەت هەندێکجار تەواوی جەستە، سوورهەڵگەڕان، قورگ و دەم وشکبوون، کزی تەرکیز و وردبینی، لەبیرچوونەوە..هتد.

هەموو ئەو ترسەش دەرەنجامی تێڕوانینی خۆی سەبارەت بە هەڵسەنگاندنێکی نەرێنی دەوروبەر بۆ تواناکان و ڕەفتارو ڕوخسارو ئەو دڵەڕاوکێیەی کە پێوەی دیارە دروستبوون، بۆیە ئەو کەسە وایلێدێت هەوڵی خۆدەربازکردن دەدات بەتایبەت لە ئامادەبوون لە کۆبوونەوە و میوانداری و بینینی خەڵکی بێگانە بەهەر بیانوێك

بێت ، تەنانەت ئەگەر بڕیاریش بدات بۆ ئامادەبوون ئەوە بێگومان ڕازیکردنیان کارێکی ئاسان نابێت، هاوکات لە هەلێك دەگەڕێت بۆ خۆدزینەوە و خۆدەربازکردن زۆر بەخێرایی.

### نموونەی شوێن و هەڵوێستە کۆمەڵایەتییەکان

- ئەنجامدانی کارێك یان قسەکردن بەرامبەر خەڵکی زۆر.
- قسەکردن بەرامبەر خەڵکانی ئامادەبووی دانیشتن یان کۆڕێك.
- چوون بۆ ئاهەنگ.
- سازدانی ئاهەنگ و میوانداریکردنی خەڵك.
- قسەکردن لەگەڵ بەڕێوەبەر.
- گەڕاندنەوەی کاڵای کڕاو بۆ خاوەنەکەی.
- خواردن و خواردنەوە لە شوێنی گشتی.
- قسەکردن لەگەڵ ڕەگەزی بەرامبەر.
- قسەکردن بە تەلەفۆن لە کاتی ئامادەبوونی خەڵکی دیکە(٣).

### ئەنجام:

لەژێر ڕۆشنایی چۆنیەتی دروستبوونو نیشانەکانو شوێنو هەڵوێستە کۆمەڵایەتییەکانی دروستبوونی ترس، دەگەینە ئەم ئەنجامەی کە بڵێین: ئەم ترسە لەلای هەموو کەسێك نییەو قالبێکی ڕێژەیی وەرگرتووە، وە ژینگەو دەوروبەر ڕاگەیاندنو خێزان... هتد هۆکارن بۆ دەرکەوتنی ئەم ترسە، هاوت چارەسەرکردنی ئەستەم نییە، چونکە لەبنەڕەتدا ئەم ترسە لۆژیکی نییەو پێویست ناکات، بەڵگەشمان ئەوەیە کەسانێك هەن لەکۆمەڵگەدا زاڵن بەسەر نەترسان لەم بارو زروفانەو لێهاتووانە ڕووبەڕوویان دەبنەوە. بۆیە ئێمەش بە سوودوەرگرتن لەوان، وە ڕێنمایی کردنمان لەلایەن کەسانی پسپۆڕەوە، دەتوانین ئەم جۆرە ترسە لەخۆمان بەدوور بگرین، وە ببین بە کەسێکی سەرکەوتوو و نەهێلێن ترسێکی لەوجۆرە تواناو لێهاتوویمان بە هەدەربدات.

### سەرچاوەکان:

١- رهاب اجتماعي، ويكيبيديا، الموسوعة الحرة.
٢- د. حسان المالح،الخوف الاجتماعي (الخجل)، دراسة علمية للاضطراب النفسي مظاهره أسبابه وطرق العلاج ، دار الإشراقات، ط٢، دمشق، ١٩٩٥.
٣- تشخيص الرهاب الاجتماعي – موقع حياتنا النفسية ٢٠٠٣.

# هەمیشە بە دوای ئاسودەییدا بگەڕێ!

محەممەد سەروەر



بەردەوامی گرەنتی مانەوەیە، بۆ بەردەوامی ژیان پێویستە مرۆڤە لە هەوڵ و کۆشش و بزاڤدا بێت، بۆ ئەوەی ژیان مسۆگەر بکەیت دەبێت بە ئاسودەیی ژیان لەگەڵ خەڵکیدا ببەیتە سەرئەوانیش لێت دڵنیا بن، زۆر گرنگە هێندە خۆشەویستی ببەخشیتەوە دەوروبەرت خۆشیان بوێیت، هەوڵبدە دەوروبەری خۆت خۆشبوێت بۆیان بسەلمێنە خۆشت دەوێن، ئایا خۆشەویستی لە ناو خێزانەکەتدا؟ دایك و باوکت خۆشدەوێت؟ لە هەمووی گرنگتر خوای گەورەت خۆشدەوێت؟ دیارە لە دایك و باوکت بیستووە کە خۆشەویستی ئەوانیت، بەمەش مرۆڤ هەست بەئاسودەیی و دڵنیایی دەکات.

کەواتە لەوباوەڕەدا بە خۆشەویستی بناغەی ژیانە، ئەوە هەستت بە ئاسودەبوون پێدەبەخشێت، خۆشەویستت دەکات لە کۆمەڵگەدا خەڵکت خۆشبوێت با خۆشیان بوێیت خوات خۆشبوێت خوای پەروەردگاریش خۆشی دەوێیت...

مامەڵە بە خۆشەویستی بکە هەست بە خۆشەویستی دەکەیت لە هەموو شوێنێك.



مسعود محمد هانەژاڵەیی

# ئایا تۆ بە هیوای هاوسەرگیریت یان نا؟

١- ئایا کاتێ باوك و دایكێك دەبینی بەیەكەوە لەگەڵ منالەكەیاندا خەم بار دەبێت؟

أ: بەڵێ ☐ ب: نەخێر ☐ ج: هەندێ جار ☐

٢- ئایا کاتێك دوو دەزگیرانداری گەنج دەبینی کەلە حاڵەتی کەیف و خۆشیدان، توشی نیگەرانی دەبێت؟

أ: بەڵێ ☐ ب: نەخێر ☐ ج: هەندێ جار ☐

٣- ئایا تا ئێستا پێشهاتووە کە چێژ وەربگری لەو کاتانەی کە تەنیای؟

أ: بەڵێ ☐ ب: نەخێر ☐ ج: هەندێ جار ☐

٤- کاتێ کەلەناو هاوڕێکانتدایت کەهاوسەردارن، بەخۆت دەڵێیت: ئەی خۆزگە منیش هاوسەرێکم دەبوو؟

أ: بەڵێ ☐ ب: نەخێر ☐ ج: هەندێ جار ☐

٥- ئایا تا ئێستا بیرت لەوە کردووەتەوە کە ئیتر بەسە؟

أ: بەڵێ ☐ ب: نەخێر ☐ ج: هەندێ جار ☐

٦- ئایا تا هەنوکە پێشهاتووە کە شادیەکانت بگوازیتەوە بۆ ڕەگەزی بەرامبەر؟

أ: بەڵێ ☐ ب: نەخێر ☐ ج: هەندێ جار ☐

٧- ئایا تۆ گوێ بۆ مۆسیقای ئارام و هێمن دەگری؟

أ: بەڵێ ☐ ب: نەخێر ☐ ج: هەندێ جار ☐

٨- تۆ لای گوڵ فرۆشێکدایت، ئایا هیچ کات هەستت پێی وتوی کە گوڵ بکڕی بۆکەسێ؟

أ: بەڵێ ☐ ب: نەخێر ☐ ج: هەندێ جار ☐

٩- ئایا ڕەنگی ژیانت گۆڕاوە؟

أ: بەڵێ ☐ ب: نەخێر ☐ ج: هەندێ جار ☐

١٠- ئایا ئەوە ڕوویداوە کەخەندە و خۆشی تاکەکان هیوای دابێتەوە بە دڵ و دەرونت، ڕوانینەکانتی لە بۆ ژیان گۆڕی بێت؟

أ: بەڵێ ☐ ب: نەخێر ☐ ج: هەندێ جار ☐

١١- کاتێ کە باوك و دایکت دەڵێن، ئیتر کاتی ژنهێنانت گەیشتووە، خەم ناخۆیت بەم قسەیە؟

أ: بەڵێ ☐ ب: نەخێر ☐ ج: هەندێ جار ☐

١٢- ئایا بەتازەی لەخەیاڵتدا ئاهەنگی هاوسەرگیریت گێڕاوە؟

أ: بەڵێ ☐ ب: نەخێر ☐ ج: هەندێ جار ☐

ئەنجام: ئەگەر لە کۆی(١٢) پرسیار(٨) وەڵامت بەڵێ بێت، بەواتای ئەوەیە کەنیازی هاوسەرگیری لەبونتدا هەیە، وە ئەگەر(٨) وەڵامت نەخێربێت، بەواتای ئەوەیە کەنیازی هاوسەرگیری لەبونتدا نیە. وەئەگەر (٥)وەڵامت هەندێ جاربێت، بەو واتایە کەهەنوکە سەرقاڵیت و نازانی کە دەبێ هاوسەرگیری بکەیت یان نا.



# ڕازی باوەڕ!

ڕەمەزان عبداللە

یەکێکی تر لە رازەکانمان باوەڕە،باوەڕ بەوەی هەموو شتێك لەم گەردونە روو ئەدا خێری تێدایە بۆمان گەر بەدیوی دووەم تەماشای بکەین ،ئەوەی بەسەرمان دێت بێ حیکمەت نیە،حیکمەتیش بی خیر نیە،خێریش بێ سوود نیە!

کەواتە ئەوەی ئەمرۆ ناومان لێناوە خراپ یان شکست بە یانی باش و سەرکەوتنە!

شکستەکانمان وەکو ناشتنی نەمامێکە، پر لەبەرە بەلام بۆ گەشە کردنی نەمامەکە پیوستی بەکاتە..!

باوەڕ بە یەخودا دەرگای گشت سەرکەوتنێکە، بەگشت کارێکەوە،ئەوەی ئەمرۆ بەشەر تێی ئەگەین خودا بەخێر دێنیتەوە رێمان!

﴿ وَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ شَرّٞ لَّكُمۡۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴾ البقرة: ٢١٦

لەوانەیە شتێکتان لا ناخۆش بێت کەچی خێر لەوەدا بێت، هەروەها لەوانەیە شتێکتان پێ خۆش بێت کەچی شەڕ لەوەدا بێت، بێگومان هەر خوا خۆی دەزانێت (خێر لە چیدایە)، ئێوە نایزانن.

جا کەوابوو ئەوەی پەروەردگار پێمان ئەدا بەنرخترە لەوەی خۆمان ئەمانەوێ!

ئەگێرنەوە رۆژێك کەشتیەك لەناو دەریا توشی زریان بوو، لەگشت سەرنشینەکان تەنها دوو کەس مانەوە کە بەسەختی خۆیان گەیاندە دورگەیەك، یەکیکیان کەسێکی باوەر دار و ئەوەی تر بێ باوەڕ بوو !

رۆژێك دوای نزایەکی زۆر" لە لایەن کەسی باوەردارەوە " لەکەناری دەریاکە هاتنە لای کەپرەکەیانەلە پر بینیان کەپرەکە ئاگری تیبەر بووە!

پیاوی بی باوەر وتی: نەفرەت لەم شەنسە بێت کە هەمووی ئەنجامی نزاکانی تۆیە!

پیاوی باوەڕدار وتی: «بێگومان ئەمەش حیکمەتێکی تێدایە،نابێ نیگەران بین،چونکە خوداوەند چاوی لە ئێمەیە ! «

سبەی بەیانی کەشتیەك هات بۆ دوورگەکە و رزگاری کردن.

رابەری گەشتیەکە وتی ـ دوێنێ چاومان بە دوو کەڵ کەوت و وتمان بێگومان پیویستیان بە یارمەتییە و هاتینە نزیك دوور گەکە "

بە تیپەر بوونی کات ئەوەی "ئەمرۆ" ناومان ناوە ناخۆشی و کارە سات گەورەیی و بەخشندەی خودای دلۆڤان بوە !

بیرت نەجێت ئەوەی روو ئەدا بێ حیکمەت نیە"لە شکست مەترسە ،چونکە سەرکەوتنە، لە خەم مەترسە چونکە دلخۆشیە "



# چۆنیەتی بەڕێوەبردنی هەست و سۆز

## Emotion management

شـەماڵ موفتی

زۆر کەس توانای ئیدارەی هەستەکانی نییە وەك: توڕەبون، خۆشی، خۆشەویستی، گومان،....هتد. یان توانای هەیە بەڵام نازانێت چۆن ڕێکیان بخات، تا ئیدارەی هەستەکانی بکات.

سایکاتریکەکان پێیان وایە -بۆ ئیدارەی سۆز و هەمو جۆرە هەستێکمان - ئەم هە نگاوانە بگرینە بەر پێش ئەوەی دوچاری چوونی کلینەکانیان بین:

١) هەستەکەت پۆلین بکە، دیاری بکە، ئایا گومانە یان ترسە، ئیعجابە یان بوغزە......هتد

٢) هەوڵ بدە پەیام و ناوەڕۆکی ئەو هەستە تێبگەیت، بۆچی گومان بکەم لە (س)؟ بۆچی بترسم لە (ص) ؟ بۆچی (ع) ببوغزێنم؟

٣) با مێشکت نەکەوێتە ژێر ئەو فشارەوە، تا بڕیاری هەڵە نەدەیت خۆت بە کارێکی تر سەرقاڵ بکە تا هاوسەنگیت بۆ ئەگەڕێتەوە و دەزانی چۆن هەنگاو بنێیت.

٤) ئەگەر هەر نەتتوانی چارەسەرێکی خۆت بکەیت، هەوڵی پشوویەك بدە بۆ بیرکردنەوەیەکی قوڵتر و دەکرێ داوای یارمەتی لە کەسانێکی متمانە پێکراو بکەیت، ئەگەر هەر چارەسەرت نەدۆزییەوە ئەوسا سەردانی سایکاترك بکە(پزیشکی دەرونی).

# یاسای باریتۆ 80 بە 20

ابراهیم برهان

هـەر یەکێك لە ئێمە کۆمەڵێك ئامانجی هەیە لەژیاندا، بەڵام دەبێ بیر لەو ئامرازانە بکەینەوە کە یارمەتیدەرمانن بۆ گەیشتن بەو ئامانجانە، دەبینین کەسانێك زۆربەی کاتەکانی ژیانیان بە هـەدەر دەدەن، بۆیە لێرەدا دەتوانین بلێین: سێ جۆر مرۆڤ هەن لە بەڕێوەبردنی کاتەکانیان:

١- کاتەکانی بەهەدەر دەدات

٢- سوود لەکاتەکانی وەردەگرێ

٣- کاتەکانی وەبەرهەم دێنێ

بۆیە ئێمە لەم نوسینەماندا باس لەیاسایەکی زۆر گرنگ دەکەین ئەویش یاسای (باریتۆ ٢٠/٨٠) ە، لە دەستپێکی بەکارهێنانی ئەم یاسایەدا، دەبێت ئەوەمان لەیاد نەچێت کە ئێمە دەمانەوێ بەکردو کۆششی ٢٠٪ سەدا ٨٠٪ ئامانجەکانمان بەدی بهێنین، ئەم یاسایە فێرمان دەکات بەکردو کۆششێکی کەم ئەنجام و دەستکەوتێکی زۆر بەدەست بێنین، بەو مەرجەی کە پلانو ڕێکخستنێکی گونجاومان هەبێت لە جێبەجێکردنی کارەکانماندا.

یاسای باریتۆ(٢٠/٨٠): فەیلەسوفی ئیتاڵی، (ئەلفریدۆ باریتۆ)ە، کە بە یەکێك لە ئابووریناسەکانی سەدەی نۆزدەهەم ئەژمار دەکرێت، هەڵسا بەدانانی یاسایەك لەساڵی (١٨٩٧ز)، کەپێی دەڵێن یاسای باریتۆ ٢٠/٨٠، یاسایەکی زۆر فراوانە بەشێوەیەك دەتوانین لەهەموو بوارەکانی ژیانماندا سوودی لێ ببینین، ئەم یاسایە فێرمان دەکات بەکردو کۆششێکی کەم ئەنجامو دەستکەوتێکی زۆر بەدەست بێنین.

گرنگی ئەم یاسایە: ئەم یاسایە پێمان دەڵێت ئەگەر لە ٢٠٪ کۆششت بەکاربهێنی ئەنجام و دەست کەوتت ٨٠٪ دەبێت ئەی ئەگەر زیاترت بەکارهێنا چی دەبێت؟!!!

بۆنموونە: قوتابی لە هەر ئاستێکی خوێندندا بێت، ئەگەر ڕۆژانە ئەو ئەرکانەی مامۆستا پێی دەسپێرێت جێبەجێی بکات،



تەنانەت ئەگەر بەکۆششێکی کەمیش بێت، بەشێوەیەك ڕۆژانە لەگەڵ وانەکانی بڕوات و لەگەڵ مامۆستا دواناکەوێت، کاتێك لەشەوی تاقیکردنەوە نزیك دەبێتەوە، تەنها پێویستی بەخۆماندووکردنێکی کـەم دەبێـت بـۆ دەورکردنـەوەی وانەکانی، بەرێژەی لە ٢٠٪، بەرامبەر بەم خۆماندوکردنە دەستکەوت و ئەنجامەکـەی دەبینێت کـە زیاترە لە ٨٠٪، چونکـە پێشـتر ڕۆژی تاقیکردنەوەکـەی لەبەرچاوگرتووە، پلان وبەرنامەی هەبووەو دەزانـێ ئـەم ڕۆژە هەردێـت، ڕۆژان ڕۆژی لەدوایە، ئەمڕۆ خۆشیەو سبەینێ هەرایە.

سروشـتی مرۆڤـی ئامانجـدار وایـە، کاتێـك ڕووبـەرووی تاقیکردنەوەکانـی ژیـان دەبێتەوە لەوپەڕی ئامادەباشـی دایە، وە بەپێچەوانـەوە قوتابـی ناچـالاك یـان ئەو قوتابیانـەی ڕۆژانە هیـچ ئەرکێکی قوتابیایەتیان بەجێنەهێناوە تاوەکو دەگاتە شەوی تاقیکردنەوە، زیاتر لە ٨٠٪ تواناکانی بەکاردەهێنی بەڵام ئەنجامو دەستکەوتەکانی کەمتر لـە ٢٠٪ دەبێت، چونکە ئامرازەکانی سـەرکەوتنی بەکارنەهێناوەو هیچ پلانێکی ڕۆژانەی نەبووە بۆ سەرکەوتنی، بۆیە بابەتی تاقیکردنەوکانی چەنـدە ڕەنجی بەدیارەوە بکێشی ناتوانی لەشەوێکدا هەمووی لەبەربکا چونکە ئەولەویاتی لەژیاندا نەبووە.

یـان ئەگەرنموونەیەکی تـر بهێنینەوە، فەرمانبەر لەدامو دەزگاکانی حکومی جاری وا هەیـە لـە٢٠٪ ی فەرمانبـەران ٨٠٪ی کارەکان ڕادەپەرینـن ،وە بەپێچەوانـەوەش لە ٨٠٪ی فەرمانبەرە ناچالاك و سسـتەکان ٢٠٪ی کارەکان ڕادەپەڕێنن.

پرسـیار: ئەگەر دوو هـاورێ بەیەکەوە لەزانکۆیـەك دەربچـن لەهەمـان سـاڵی خوێندنـدا، هەمان کاری هاوشـێوەی یەکیان کرد، هەریەکـەو کۆمپانیایەکیان دامەزراند، ژمـارەی کرێکارەکانیشـیان وەك یـەك بوو، بەڵام دوای پێنج سـاڵ ئەنجامو دەستکەوتیان وەك یـەك نەبوو ئـەوەی یەکەمیان قازانجی سەدهەزار دۆلار زیاتربوو لەداهاتی هاوریکەی تـری. وەڵامـی ئـەم پرسـیارە ئەم یاسـایە زێرینەیـە، یاسـای ٨٠/٢٠ ،کـە دەڵێ هەموو ٨٠٪ ئەوقازانجەی دێتە کۆمپانیا دەگەڕێتەوە بـۆ٢٠٪ ی کرێـکارەکان، وە لـە کۆمپانیاکەی تـری هاوشـێوەی کـە داهاتیـان کەمتربوو، ٢٠٪ی ئەو قازانجەی دەگەڕێتەوە بۆ کۆمپانیا ئەنجامو دەستکەوتی ٨٠٪ کرێکارەکانەوە بۆیە بەپارەیەکی زۆر کەم دەگەڕێنەوە ماڵەوە.

بەگوتەیەکـی تـر دەتوانیـن بڵێیـن: لە ٨٠٪ەکان بە٢٠٪ قازانج دەگەڕێنەوە ماڵەوە، بەڵام ٢٠٪ەکان بەقازانجـی ٨٠٪ دەگەڕێنـەوە ماڵـەوە ،ئەگەر پلان و ڕێکخستنیان نەبوو لەکارەکانیان.

لەکۆتاییـدا دەڵێیـن: بەهاوقـەدرو سـەرکەوتنی هـەر وڵاتێك بـەزۆری گەلو هۆزو سـوپاو هێزەکەی نیـە، واتە پێوەری سـەرکەوتنی هـەر وڵاتێك پەیوەسـت نیە بـەزۆری ژمارەی هـۆزو گەلەکـەی بەقەد ئەوەی ئەم وڵاتـە چەندەپێکهاتەو ئامرازی سـەرکەوتنی هەیـە لەپـلانو ڕێکخسـتنی ئیشـوکارەکانی، ئەگـەر نمونەیەکی زیندو بهێنینـەوە موسـڵمانەکان کـە ڕووبەڕووی بێبـاوەرەکان بوونـەوە بەژمـارەو هێـز ڕووبەرویـان نەبونـەوە بەڵکـو بەئیمـانو بیروباوەڕی پتەویان ڕووبەروویان بوونەوە، (کم من فئە قلیلە غلبت فئە کپیرە کپیرە بـأزن اللە واللە مع الصابریـن) البقرە:٢٤٩ لێرەدا فێری ئەوە دەبیـن پەندوئامۆژگاری بەزۆرینـە نیـە بەڵکـو بەچۆنایەتیە ئەم پەنـدە چەنـدە جوانـە کەدەڵـێ: (کـەم وپوخـت، نـەك زۆرو بـۆر)، ئەم یاسـایە جەخـت دەکات لەسـەر ئـەوەی کـە ئێمە لەهەموو کاروبارەکانی ژیانمان کار لەسـەر ئەو ئیشانە بکەین کە بەرهەممان زیادەکات، واتـە ئەگەر ٢٠٪ی کاتەکانی خۆمان بگرین، ئەنجـامو دەسـتکەوتی زیاتـر لـە٨٠٪ ی بەدەسـت دەهێنین.بۆیە بـا وەك پڵنگ بین بە یەکـەم تێڕوانینی بۆنێچیرەکەی دەزانێ کەئایا ئەم نێچیرەی بەردەمی شـیاوی ئەم ماندوبەنەیە کەلەپێناویـدا ڕەنجی بۆدەدا، ئەگەر وەڵامەکـە نەخێر بوو، ئەبێ بیر لە ڕاوکردنـی نێچیرەکە بکاتـەوە بەکەمترین ووزەو کەمترین کۆشش.




نووسینی: دکتور عمادالدین خلیل
وەرگێڕانی: (احسان برهان الدین)

### ئەڵقەی دووەم

هاوشێوە نین جارێکی تر... ئیسلام واقیعی یە کاتێك - تەنانەت ئەوەش کە پێی رازی نابێت-، ناوی ڕازاوەیی یان جوانی لێ دەنێ... بەڵام جیاوازی دەکات لە نێوان ئەو جوانی یەی کە بەرەو هەق دەتبات و، ئەو جوانی یەی بەرەو ناهەق دەتبات، لە نێوان ئەو جوانی یەی کە هەندێ پێویستی سەرەکی مرۆڤ تێر دەکات و، ئەو جوانی یەی کە شتگەلێك تێر دەکات مرۆڤ لە ڕێگەیەوە دەبات بەرەو ناشیرینی و سوکایەتی.

لە ڕاستیدا زاراوەکانی حەلاڵ و حەرام و موباح و مەندوب و مکروە... لە ئیسلامدا پەیوەندی بە دەرئەنجامە جوانەکانەوە هەیە، هەروەها بە هەموو شتێکەوە لەم ژیانەدا... هەندێ جوانی هەیە لە بازنەی حەلاڵیدا یە، بەڵکو دەبێتە واجبیش... جوانی یەکیش هەیە لە بازنەی قەدەغەکراویدایەو، دەبێتە کارێکی قێزەون..

ئەگەر ڕێرەوە دەستکردەکانیش لە ڕوانگەی خۆیانەوە لە ڕووی هزر و بیر و باوەڕەوە جوانی پۆلێن دەکەن، بەو پێیەیش هەندێ جوانی قبوڵ دەکەن و، هەندێکی ڕەتدەکەنەوە، ئینجا مارکسیەت لەو بارەوە گەیشتووەتە ئاستێك بە ئارەزوی خۆی شت ڕەوا دەکات و، قەدەغە دەکات، بانگەشەش دەکات بۆ چەند بەشێك لە جوانی و دژایەتی چەند بەشێك دەکات... بەڵام لە ڕوانگەی ئیسلامی یەوە پێویستە تێبینی ئەو ئاراستە نەخشە بۆ کێشراوە بکەین سەبارەت بە جوانی و تێکەڵی نەکەین لە نێو هەموو شێوەکانی جوانیدا و، مامەڵەیان لەگەڵ نەکەین وەکوئەو کەسەی تووشی نەخۆشی (عمی الالوان) تێکەڵکردنی ڕەنگەکان بووە، واتە ڕەنگەکان لە یەك ناکاتەوە.

#### ڕتکردنەوە بۆ شێواندن

ئەگەر چی ئیسلام جوان بە جوان ناو دەبات، با لە قسەو دیدە پاراوەکەشی دەربچێت بۆ شتەکانی تر، بەڵام لە هەمان کاتیشدا ڕێگە نادات بە جوانکردنەوەی ناشیرین و بە رزکردنەوەی بۆ ئاستی بەڕاست تەماشاکردنی... چونکە ئەو تۆ کارێك زیاتر نییە لە شێواندن بۆ واقیع و درۆ کردن لە بەر ڕاستییەکان و، هەوڵدانێکە بۆ ڕوکەشی کردنی بریقەدار بۆ ئەو شتەی لە خودی خۆیدا نابووت و ناشیرینە...بەڵکو ئەوە پاڵیشیان پێوە دەنێ بۆ ئەوەی بکەونە نێو حەرام و ناڕەواوە، بە شێوەیەك هەق و ناهەق تێکەڵ بن... (زين لهم سوء أعمالهم والله لا يهدي القوم الكافرين) التوبە ٣٧.

کاتێك ناشیرینی دەبێتە بەهایەکی داواکراو

ئەوەیش تێڕوانینێکی ڕەسەنی جوانیی ئیسلامی و، ئەو جوانی یەکانی تر کە چەندین وێژە و هونەری لێوە هەڵقوڵاوە.... بە تایبەتی ڕێرەوی (الواقعية) و (الطبيعية) زیادەڕەوی دەکەن لە جوانکردنەوەی ناشیرین و، ڕازاندنەوەی بە قسەی شیرین و هونەری جوان، ئەوەندەیش جەخت دەکەنەوە لە سەر ئەو واتایە، تاکو نابووت رزگاری دەبێت لە ناشیرینی خۆی لە دیدی خەلکەوە و، دەگۆڕێت — سەرەڕای هەموو بەها دژە ئەخلاقییەکانی — بۆ بەهایەکی داواکراو و شتێکی جوان، جوانی ئیسلامی ئەو فریودانە ڕەتدەکاتەوە، بەڵکو حەرامی دەکات و بنەبری دەکات و ، ئەو کەسانەیش بە درۆزن ناو دەبات کە هەوڵی شێواندنی ژیان دەدەن لە ڕێگەی بە کار هێنانی ئامرازەکانی جوانی کە خوای گەورە پێی بە خشیون، جێی خۆیشی بوو بە کار نەهێنرایە لە بە هێزکردنی جوانیی ڕەسەن نەبێت و، هەروەها بۆ ئاشکراکردنی نابووتی و ناشیرینی بەمەبەستی بنەبڕکردنی لە گۆڕەپانی جیهان و بوارەکانی ژیاندا.

#### دەزگاکانی پێشوازیکردن

خوای گەورە کە هەموو شتێکی بە ڕیکوپێکی درووست کردووە، ڕووبەڕووی زانیارییە جوانەکان لە گەردوون و جیهان و سروشت و ژیاندا، هەندێك دەزگای پێشوازیکردنی داناوە کە مامەڵەی لەگەڵدا بکات و، مرۆڤ بگوێزێتەوە بۆ ئاستگەلێکی پێگەیشتووتر لە سەر ڕێکوپێکی تاك و داهێنانی شارستانی، بەم شێوەیش جوانی کاری خۆی جێبەجێ دەکات.

لە ڕاستیدا بیستن و بینین و بەرکەوتن و تامکردن و بۆنکردن، ئەو دەزگایانەی کە پێشوازی دەکەن و زانیارییەکان دەدگوێزنەوە

بۆ بیر و هۆش بۆ ئەوەی جیایان بکاتەوە ، بیانپاڵێوێ، هەروەها دڵ و ویژدان بۆ ئەوەی پێیان کارێگەربێت ، لە دوای هەموو ئەمانەشەوە سەرسوڕمان و حەزکردن دروست دەبێت، ئینجا ئەو دەربڕینە دروست دەبێت کە دەنووسرێت و نیگار دەکێشرێت و دەتاشرێت و دەگرێت بە ئاواز و دەژنرێت و وێنە دەگیردرێت...

ئەو هەژاندنەی کە سنووری بیروهۆش تێدەپەڕێنێ

ئەوەی قورئان بخوێنێتەوە تووشی سەرسوڕمان دەبێت، چی بە ئەو هەموو ئایەتانە وەکو تەوژم هەڵدەقوڵێن لەئاماژە کردنێکدا بە گوێ و چاو ودڵ و، جەخت دەکاتەوە لە سەر بە گڕخستنەوەیان و، نارەزایی دەردەبڕێت بەرانبەر هەموو کەسێك هەوڵ دەدا بۆ راگرتنیان و پەکخستنیان. بەڵام لە پاش چەند ساتێکی کەم سەرسوڕمانی نامێنی و بەقەناعەتی تەواو دەگات ، بە هۆی ئەو دەنگدانەوەی لە قورئانەوە دەیبیسێ....چونکە سەرەرای ئەو دەزگایانەی تایبەتن بە هەست و هۆشەوە کە یەکێکە لە بە هێزترین شێوازەکانی ئیعجازی خوایی لە بوونەوەردا (بۆ نمونە با ئەو سێ ملیون وەتەرە بە بیری خۆماندا بهێنین کە لە کەناڵی (ئوستاکی) پێکهێنراوە، هەروەها پێکهاتەی سەرسورهێنەری چاو، ئەوەی کە (داروین) دەربارەی دەڵێ: هەرکاتێك بیر بکەمەوە لە پێکهاتەی چاو، تەزوو بە گیانمدا دێت و هەرگیز بێ باوەڕ نیم بە بوونی پەروەردگار!!

ئەمە سەرەرای ئەوەی ئەو دەزگایانە هۆکارن بۆ جێبەجێکردنی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و جیهان بە هەموو ئەو وزەو یاسایانەی کە ئادەمیزاد فرمان و ئەرکەکانی لە سەر بنەمای رادەپەڕێنی لە زەویدا ، بۆ راپەراندنی ئەرکی ئاوەدانکردنەوەی ئەم جیهانەو پەرەپێدانی.

سەرەرای ئەمەو ئەوەش ، ئەم دەزگایانە کاری خۆیان ئەنجام دەدەن لە سەر ئاستی ئاڵوگۆڕکردنی جوانی لە نێوان ئادەمیزاد و نیعمەت و نیشانەکانی خوای گەورە کە بڵاون لە هەموو جیگایەك، لە هەمان رێگەشەوە لە رینەوەی ویژدان دروست دەبێت کە بەرز دەبێتەوە سەر بیرکردنەوەی پەتی و، سنورەکانی ئەقل و مەنتیق بە جێدەهێڵێ لە بەخشینی ئیمان و ئاسوودەییەکی قوڵتر بە ئادەمیزاد بە داهێنەری ئەم گەردوونە سەر سورهێنەرە..... جوانە......

بانگەشەیەك بۆ بەگڕخستنی چاو لە لاپەرەی گەردووندا

با گوێبیست بین بۆ هەندێك لە بانگەوازە یەك لە دوای یەکەکانی قورئان لە مەڕ بە کار هێنانی هەستەکان لە گەردوونی جواندا و، مەشق پێکردنیان لە سەر هەمیشە بەردەوامی لەگەڵ سروشت و جیهان، بۆ مەبەستی زۆر کردنی سەرمایەی ئادمیزاد لە سەر هەموو ئاستەکانی ئیمان و کردەیی و، جوانی (ولقد ذرأنا لجهنم كثيرا من الجن والانس لهم قلوب لا يفقهون بها ولهم اعين لا يبصرون بها ولهم آذان لا يسمعون بها اولئك كالأنعام بل هم أضل..) االاعراف١٧٩ هەروەها ئایەتەکانی :القصص ٧٢، هود ٢٠،الانعام٥٠ ،الانسان ٢ الملك ٣-٤النور ٤٤، الاعراف ١٨٥، الروم ٥٠ ،الانعام ٩٩ ، الحجر ١٦.

## هەندێکیش بۆ بەگەڕخستنی گوێ

ئەوە هەندێك بوو دەربارەی ئەوەی قورئان پێشکەشمانی کردووە سەبارەت بە چاو، ئەی چی فەرمووە دەربارەی گوێ ؟ لە راستیدا قورئان بە هەمان شێوە بە چڕی جەخت دکاتەوە لە سەر پێویستی بایەخدان بەم هەستە بۆ بەردەوام بوونی پترو ژیرانەتر لەگەڵ گەردوون و سروشت و ژیان ، تاکو دەگاتە راستی بوونەوەر و یەکتاپەرستی پەروەردگار، هەروەها راستەقینەی ئایین بە شێوەیەکی ڕەها کە خوای گەورە پێغەمبەرە بەرێزەکانی پێ رەوانە کردوون و، نارەزاییشی دەربڕیوە بەرامبەر ئەوانەی کە نەیانتوانیوە ئەم هەستە بە کار بهێنن بۆ گەیشتن بەو ئاستەی شایستەی ئادمیزادە: (ولا تكونوا كالذين قالوا سمعنا وهم لا يسمعون) الانفال ٢١، هەروەها ئایەتەکانی: القصص ٧١، البقره ١٧١، الانعام ٣٦، الاعراف ١٠٠.

## پلەی نزم

با بیر بکەینەوە لەو دیمەنە رەشەی کە قورئان هەمیشە باسی دەکات دەربارەی ئەوانەی کە پەیوەندی هەست و هۆشی کارێگەری خۆیان دەپچڕێنن لەگەڵ جیهاندا ، ئەو پەیوەندییە لە دەست دەدەن نەك لە بەر نەبوونی ئەقل و ئامرازەکان، بەڵکو لە بەر ئەوەی پەردەکانیان لە سەر داخستووە و، نەیانزانیوە چۆن هانی بدەن لە سەر کارکردن و توانا کانیان بە هێز تر بکەنەوە، هەر بۆیە وەکو قورئان باسی کردوون (صما) و (عميا) و (لا يفقهون) کوێر وکەڕ دەبن و نیعمەتی تێگەیشتن لە دەست دەدەن ، پلەش نییە لەوە نزمتر!!

## خۆتان جوان بکەنەوە!!

لە دیدی ئیسلامەوە، مەسەلەکە لەئاستی دانپێدانان، یا جەختکردنەوە لە سەر راستەقینەیی جوانی پێکهینانی گەردوون و جیهان و سروشت و دروستکردنی بونەوەر راناوەستێت، بەڵکو ئەوە تێدەپەڕێنێ بۆبانگەشە کردن بۆ کارکردن بە خۆڕازاندنەوەو، خۆ جوانکردن لە هەڵسوکەوتەکانی موسڵماندا و، سوود وەرگرتن لە یاساکان و زانیارییەکانی، بەڵکو فەرمانکردنیش بەوە کردووە:(ولقد ذرأنا لجهنم كثيرا من الجن والانس لهم قلوب لا يفقهون بها ولهم اعين لا يبصرون بها ولهم آذان لا يسمعون بها اولئك كالأنعام بل هم أضل.. ) االاعراف١٧٩

ئینجا ئەو بانگەشەیە، یان— بە دەر بڕینێکی وردتر — ئەو فەرمانە داوای خۆ جوانکردنەوە دەکات لە ئادمیزاد، لە کاتێکدا روو دەکاتە ئەنجامدانی گرنگترین کردەوە کە پەیوەندی بە لایەنی ڕوحیەوە هەیە ئەوەیش نوێژە ...

موسڵمان لەم بازنە تەنگە سنووردارە لێی حاڵی نەبووە، بەڵکو ئاسۆی بینینی فراوانتر کردووەتەوە ،وەکو چۆن لە هەموو ئاراستەیەکی قورئانی، یان- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هاتووە بۆ ئەوەی هەموو رووبەرو هەڵسەکەوتەکان بگرێتەوە، لە راستیدا ژیانی مرۆڤی موسڵمان لە هەموو بوارەکانیداو، لە هەموو وەرچەرخانەکانیدا پێویستە رێکوپێك و شۆخ و پاك بێت ....لە خواپەرستن و کار و هەڵسوکەوت و، جل و پۆشاك و، رەوشت و، ئاکار و، ئاوەدانکردنەوە...لە ماڵ و شەقام و کۆڵان و و فەرمانگە و دامەزراوەکانماندا.... تەنانەت لەقژ و ریش داهێنانمان و بۆ نخۆش کردنی خۆماندا.

## بۆیە ئەو فستیڤاڵە دروست بوو!!

بەجوانی و خاوێنییەوە بچینە نێو مزگەوتەکانەوە و..... هەموو جێگایەکی تریش ... رەچاوی جوانی بکەین لە هەموو کردەوەو مامەڵەیەکدا.........موسڵمانان بە چاکی لەوە گەیشتن و، زانییان چۆن ژیانی خۆیان جوان بکەنەوە، بۆیە ئەو فستیڤاڵە بیناسازییە ناوازەیە دروست بوو لە مزگەوتەکاندا ... بۆیە ئەو شارە جوان و قەشەنگانەیان دروست کرد، هەروەها ئەو هونەر و رێکوپێکی یە لە خواردن و پۆشاکدا و ..... لە هۆنراوە و، نیگار و جواننوسی و رەنگەکان دا.

لەنووسینێکی دکتۆر (عماد الدين خليل) وەرگیراوە بە ناونیشانی: (حديث عن الجمال في الاسلام).



# پێوەرەکانی سەرکردەی ئیسلامی

ئومێد مستەفا
ئەڵقەی یەکەم

لە ژێر رۆشنایی ئایەتی ((ان خير من استأجرت القوي الامين)) القصص ٢٦، باس لە دوو پێوەری گرنگ و سەرەکی سەرکردەی ئیسلامی دەکەین، پێوەرەکانیش بریتین لە:

پێوەری یەکەم: هێز (القوه)

پێوەری دووەم: ئەمینداریتی (لامانه)

هێزو ئەمینداریتی ئەو دوو دووپێوەرەن کە هەموو ماناو خەسڵەتە بەرزەکانی سەرکردە لە خۆ دەگرێت هەروەکو زانایان و پسپۆڕانی کارگێڕی لە جیهاندا باسیان لێوە کردووە.

## پێوەری یەکەم: هێز (القوه)

مەبەست لە هێز واتا لێهاتوویی و زیرەکی و توانای سەرکردە لە راپەراندنی کارو ئەرکەکانیدا، هەڵبەتە جۆری تواناو هیزەکەش جیاوازدەبێت بەپێی جیاوازی مەهامەکان. زانای ناوداری ئیسلامی (ابن تیمیه) سەبارەت بە چەمکی هێز دەفەرموێت: هێز بەپێی جۆری دۆخەکە دەگۆڕێت بۆنموونە هێز لە سەرکردایەتی کردنی جەنگدا دەگەرێتەوە بۆ ئازایەتی دڵ و شارەزابوون لە هونەر و فێڵی جەنگ، هێزیش لە داوەری کردن لە نێوان خەڵکیدا دەگەرێتەوە بۆ شارەزابوون لە چەمکی دادگەری کە قورئان و سوننەت ئاماژەیان پێداوە، لەگەڵ توانا لە جێبەجێ کردنی حوکمەکاندا.

## لە سیماکانی لە دەستدانی هێز:

١- رۆتینییانی تاقەت پڕوکێن: نیشانەکانی ئەم دیاردەیە بریتیین لە هێواشی بەڕێکردنی ئیش و کارەکان و رایی کردنیان، ئەمەش هەم دەبێتە هۆی بێزاری و وەرس بوون،و هەمیش هۆکارێکە بۆ دروست بوونی فشارو پاڵەپەستۆ بۆ سەرکارەکان، هەروەها فاکتەرێکیشە بۆ بەهەدەردانی کاتێکی زۆر، نموونەی ئەم جۆرە روتینییاتانەش لە وڵاتی خۆمان زۆر بە زەقی دەبینرێت.

٢- لاوازبوونی لایەنی رۆحی: نیشانەکانی ئەم دیاردەیەش بریتیین لە کزبوونی ئیمان لە دڵەکان و کەمی داوای لێخۆش بوون کردن لە خوای باڵادەست، چونکە بەردەوامی ئیستیغفار کردن سەرچاوەی هێزوپێز بەخشین و یارمەتیدانی پەروەدگارە بۆ بەندەکانی، دیارە بوونی ئیستیغفاری بەردەوام و ملکەچی کردن بۆ خودای گەورە خاڵی جیاوازی ئیسلامە لەگەڵ سیستمەکانی خۆرئاوا و بواره زانستەکانیان. کە ئەمەش نهێنی بەدەستهێنانی هێزی مەعنەوی و ئابوورییە کە بەداخەوە لێی بێ ئاگاین، حەقیقەتی ئەمەش لە ئامۆژگارییەکی پێغەمبەر هوددا (سەلامی خوای لێ بێت) بۆ گەلەکەی بەرجەستەدەبێت کە بوونی(ئیستیغفار) و گەڕانەوە بۆ پەروەردگاریان دەکاتە مەرجی سەرەکی دەستکەوتنی ژێرخانێکی مەعنەوی و ئابووری بەهێز،هەروەك دەفەرموێت: ((يا قوم استغفروا ربكم ثم توبوا اليه يرسل السماء عليكم مدرارا و يزدكم قوة الى قوتكم)) هود ٥٢، واتە: ئەی گەلەکەم داوای لێبووردن لە پەروەردگارتان بکەن دواتر بگەڕێنەوە بۆ لای ئەو ئەگەر وابکەن خوا لە ئاسمانەوە باران بە لێزمە دەبارێنێ بەسەرتاندا و هیزی تر زیاد دەکات بۆ هێزەکانتان.



# قورئان چیم پێدەبەخشێ؟!

ئا: بەهەشت عەلی

ئێوارەیەك باپیرە لەناو چڵەپۆپەی چڕی باخچەکەی خۆیان دانیشت بوو، خەریکی زیکر و یادی خوای گەورە بوو کوڕەزا مێرد منداڵەکەی کە تازە خەریك بوو بەرەو ژیانێکی نوێ و هەرزەکارانە ئەهات، هاتە لای و پێی وت: ئایا باپیرە ئەم قورئانە سودی چییە بۆ من؟ خۆ من هەر ئەیخوێنمەوەو لێی تێناگەم، باپیرەی زانا کەمێك سەیری کرد و پاشان سەبەتەیەکی لەپوش چنراوی پێدا(کە ناو سەبەتەکە ڕەش کرا بوو)،پێی وت: بڕۆ کوڕم بەم سەبەتەیە لەو کانیەی خوار خۆمانەوە ئاوم بۆ بێنە، کوڕەکەش لەم قسەی باپیرەی سەری سوڕما و پێی وت: ئاخر باپیرە خۆ ئەمە ئاوی تیا ناوەستێ، هەمووی لە پوشەکانەوە ئەڕژێ ئیدی چۆن ئاوی پێ بێنم؟

باپیرەش وتی: ئەزانم کوڕم تۆ بڕۆ بیهێنە، کوڕەزاکەشی بەرەو کانیەکە بەڕێ کەوت وکاتێ گەیشتە کانیەکە سەبەتەکەی پڕ کرد لە ئاو و پاشان گەڕایەوە بۆ لای باپیرەی، بەڵام تا گەیشتە لای باپیرەی هیچی تیا نەما،پێی وت: ئەوەتا باپیرە خۆ من وتم ئاوی تیا ناوەستێ، باپیرە وتی: دوبارە بڕۆ ئاوی تیا بهێنە، دووبارە ڕۆیشتەوە ئەمجارەش هەر بەهەمان شێوە هیچ ئاوێکی تیا نەما، باپیرە وتی: جارێ تریش بڕۆ، ئەم کارەی چەندجار پێ دووبارە کردەوە، تا لەکۆتاییدا وتی: کوڕم دانیشە سەیری ئەم سەبەتەیە بکە، یەکەم جار بردت ناوەکەی ڕەش ڕەش بوو، بەهۆی ئەوەی چەند جار ئاوت پێ هێنا (هەچەندە سودت لە ئاوەکەی وەرنەگرت) بەڵام خۆ ئەبینی ناو سەبەتەکەی جوان و سپی و خاوێن کردۆتەوە، بۆیە دڵنیابە هەرچەندە لە قورئانیش تێنەگەیت بەڵام بەبێ ئاگایی خۆمان دڵ و دەرونمان پاك و خاوێن و سپی ئەکاتەوە لە ڕەشی تاوانەکان، نەتتوانی سود لە سەبەتەکە وەربگریت و ئاوی تیا بهێنی، بەڵام خۆ سەبەتەکە سپی و خاوێن بوەوە.

ئەمە جوانترین وڵامە بۆ کەسانێك بە هەڵە بیردەکەنەوە ودەڵێن قورئان خوێندن هیچ سودی نیە چونکە لێی تێ ناگەم ئیدی بۆ بیخوێنمەوە، دڵنیابە هەرچەند تۆ لێی حاڵی نەبیت بەڵام دروست کەرەکەی پاداشتت ئەکات لە خوێندنەوەی، ئەوەتا پێغەمبەر و سەرداری مرۆڤایەتی (صل الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (هەرکەسێك پیتێك لە قورئان بخوێنێت یەك چاکەی بۆ دەنوسرێت وە چاکەش لای خوای گەورە یەك بە دەیە، من ناڵێم الم یەك پیتە، بەڵکو ئەلف پیتێکە و لام پیتێکە و میم پیتێکە)، لە پاداشتی ئەم چاکانەیە کە دڵ و دەروون ساف وخاوێن دەبنەوە و تەرازووی حەسەناتی دوارۆژیش قورس دەکات، هەر کەسێکیش بیەوێت ئەتوانێ لێی تێبگات، دووبارە پێغەمبەری ئازیز (صلی الله علیه وسلم) ئەفەرموێت: (خوای گەورە هەرکەسێکی خۆش بوێت لە دینی خۆی شارەزای دەکات)، هەوڵی مرۆڤیش بۆ گەیشتن بەهەر شتێکی بەرز و ناوازە پێویستی بە ماندوو بون هەیە، بێگومان هەوڵەکان زۆرتر بن بەرهەم و دەستەکەوتەکان باشتر دەبن، جا ئەگەر ئەمەش لە سنووری ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا بێت سەرەڕای دەستکەوتنی پاداشتی زۆری دنیا و قیامەت هۆکاری سەرەکییە بۆ نزیك بوونەوە لە خوای گەورە.

# وانەی بیرکاری فێری کردم!

و: برەو

* بیرکاری فێری کردم: سالب کەڕەتی سالب بکەین یەکسانە بە موجەب، بێ ئومێد مەبە نارەحەتی دوای ناڕەحەتی بەمانای رزگاربوون دێت.

* بیرکاری فێری کردم: کە دەتوانین بەچەند رێگایەك بگەینە ئەنجامی راست، وا مەزانە تەنها تۆخاوەنی راستیەکانیت و هەر کەسێك پێچەوانەی تۆ بێت هەڵەیە.

* بیرکاری فێری کردم: هەموو شتێکی نادیار بەهایەکی هەیە، جا رق لەکەسانێك هەڵمەگرە کە نایناسیت.

* بیرکاری فێری کردم: ژمارەی سالب هەرچەند ژمارەکانی گەورە بێت، ئەوەندە بەهاکەی بچوك دەبێتەوە، وەك ئەو کەسانە وان کە لوت بەرز و خۆ بەگەورە زانن بەسەر خەڵکیدا، هەرچەندە خۆبەگەورە زانتر بن ئەوەندە لەبەرچاوی خەڵکیدا بچوك و سووك دەبن.

* بیرکاری فێری کردم: کۆتاییە جوانەکان، لەکاتی تەواوکاریدا دێتە دی.

* بیرکاری فێری کردم: گەر شیکارکردنی هاوکێشەیەك ئەستەم بوو، ئەوا پەنا بۆ خەیاڵ ببە.

* بیرکاری فێری کردم: کورترین رێگا لەنێو دوو خاڵدا بریتیە لە هێلێکی راست.

* بیرکاری فێری کردم: بۆ ئەوەی هاوکێشەکان راست بن، ئەوا پێویستە هەردوو لای هاوکێشەکە یەکسان بن.

* بیرکاری فێری کردم: نەبوونی شیکار، واتە بوونی شیکار.

* بیرکاری فێری کردم: شتێك هەیە بەناوی کۆتایی نەهاتوو، جا لەبیرکردنەوەو خواستەکانتدا سنووردار مەبە.



# حەقیقەت و ڕامان!

بەلێن ئەنوەر

ئەو فاکتەرو هۆکارانەی هەندێک لە ئینسانەکانیان گەیاندۆتە لوتکەو هەندێکیشیان نزمکردۆتەوە» هەر خودی ئینسانەکانن. ئێمە لە زۆر لایەنەوە ئامانجمان نییە ئیرادەمان نییەو نرخی بەهرەکانمان نازانین. کارەکانمان بەپێوەرێکی کورت و بچوک هەڵدەسەنگێنین لەپێناو ئامانجێکی کاتی و خێرادا! زۆرێکمان هەر لەشوێنی خۆی دەخلیسکێت و هەستیشی پێناکات. لەبەر ئەو هەموو نارەزایی و ڕەشبینییەی لە دەرونماندا لەمەڕ ژیان و زیندەگی هەمانە، بەهەشتێك لە کەهکەشانی فەلەك لەخەیاڵدا بۆ خۆمان دروستدەکەین و چاوو سەرنج و تەسەورەکانمان ملکەچی فەرمانەکانی بەرژەوەندی و ئارەزووەکانمان دەکەین و هەر بەو خەیاڵەوە خەو بە لووتکەکانەوە دەبینین.

باشە ئەم هەموو هیجرەت و دەنگی نارەزاییە لەبەر چی، بۆ نرخ و قەدری ئەو شتانە نازانین کە لەئێستادا هەمانە؟ بەڕاستی ئێمە لەهەندێک بواردا تەواو پێچەوانە بیردەکەینەوە، لەئێستادا نوقمی خەیاڵ و فانتازیا بووین «کەچی دەمانەوێت ئەم خەیاڵە لە دوارۆژدا بکەینە ڕاستی و بە داهاتوو بیگۆڕینەوە! من نالێم ئینسان لە ئێستادا خەو بە داهاتویەکی ڕونەوە نەبینێت، نەخێر «ئێمە دەڵێین ئێستا لە واقیعێکدا دەژین کە شایەنی لێکدانەوەو باوەڕو کردارە نەك خۆزگەی بێ بنەماو خەوو فانتازیا ئێمە ئەگەر لەئێستادا نرخی کات و ڕوداوو پێشهاتەکان نەزانین، چۆن دەتوانین ئەو حەقە بەخۆمان بدەین و بڵێین: ئاینده بۆ ئێمەیە؟ ئەگەر ژیان لە دەرئەنجامەکانی کرداری مادییەت و سامان و دارایی کەسانی ترەوە لە داهاتودا پشکێکی بەر ئێمە بکەوێت، خۆ لەدەرئەنجامەکانی کردارە عەقڵی و ئەخلاقی و دینی و زانستیەکانی پێشەنگە ئەزمونداره‌کانمان هیچ شتێکمان بۆ نامێنێتەوە کە ئەسڵی نەریتو کلتورو ڕەسەنایەتی خۆمانی پێ بپارێزین، کەواتە با دروشمە جوانەکانی خۆمان نەدۆڕێنین و دەروازەو پێشەنگێکی ناوازە بین. کاتێك ئارەزوی چالاکیەك دەکەی ڕاستەوخۆ دەسپێبکە . کاتێك دەتەوێ بڕیارێکی سودبەخش بدەی ڕاستەوخۆ بەڵێن بەخۆت بدەو بڕیارەکە دەربکە. کاتێك بیرۆکەیەك لە مێشکتدا گەڵاڵە دەبێ ڕاستەوخۆ دایبڕێژە ئەگەرچی زۆر کەمیش بێت، من کاتێك ئەم بیرۆکەیەم لە مێشکدا بۆ دروستبوو ڕاستەوخۆ ئەم بابەتەم نووسی . کاتێك دەتەوێت دەسپێبکەی ڕاستەوخۆ دەسپێبکە» مادام تێگەیشتوی و دەزانیت سەرەتایەك هەیە.

هەستکردن بە هەندێك بوارو بابەتی سەرەتایی و بچوك، نرخ و بەهای خۆی هەیە. تۆ ئێستا خاوەنی زۆر شتی گرینگی بەلام نرخیان نازانیت «لەبەر ئەوەی متمانەو بڕوات پێیان نییەو خۆت فێری هونەری بەکارهێنانیان نەکردووە. ئایا تۆ گوێت لەو کەسانە نەبووە کە گەیشتونەتە لوتکە بەرزەکان و توانیویانە بەسەر تەنگو چەڵەمەکاندا زاڵبن چی بە ئێمە دەڵێن؟ ئەوان بەئێمە دەڵێن: ئەگەر بمانتوانیایە تەمەن و کات و وزە بەکارنەهێنراوەکانی کەسانی تریشمان دەکڕی و بۆ سەرکەوتنی زیاتری خۆمان بەکارمان دەهێنا!

دەزانن ئەمە مەعنای چییە؟ مەعنای ئەوەیە کە ئەوانیش وەکو من و تۆ بوون و خاوەنی هەمان غەریزەو پاڵنەرن و هیچیان لە ئێمە زیاتر نییە تەنها ئەوە نەبێت کە ئەوان لەدەروازەی نهێنییەکان تێگەیشتون و چونەتە ژورەوەو نرخی گرفت و مەینەتی و ئازارەکان دەزانن و لەبەرامبەریاندا ئارامدەگرن، ڕوداوەکانی ئێستایان بەبێ نرخ و بەسوکی سەیر ناکەن بەڵکو بەڕاستی دەیانبینن و کاردانەوەی ڕوداوەکان باوەڕی لە دڵی ئەواندا دروستکردووە. کەواتە ئێمە دەبێت نرخی ئێستاو ئەو ڕاستی و گۆڕانکارییانەی لێمان ڕودەدات بزانین و بە گاڵتەو شتێکی ڕێکەوت و مەحاڵ و سەر قاڵکەریان نەزانین، چونکە هیچ شتێك ناگۆڕێت، بەڵکو ئەوە ئێمەین کە دەبێت بگۆڕێین.

# به دەستی خۆتە

و: ئیمان ناصح

لە ڕۆژانێکدا دوو برای زۆر ژیر دەژیان، هەستیان دەکرد کە زانیاری قوتابخانەو چواردەوریان بەشیان ناکات.

بۆیە دایکیان گەڕا تا زانایەکی لە ناوچەکەدا بۆ دۆزینەوەو کوڕەکانی بردنەلا.

دوو براکە هەموو جارێك بڕێکی زۆر پرسیاریان لە زاناکە دەکردو ئەویش وەڵامی دڵنیاکەرەوەی دەدایەوە ئەمەش زۆر خۆشحاڵی کرد بوون، بۆیە ئیزنیان لە دایکیان خواست بۆ ماوەیەك لەلای زاناکە بمێننەوە تا شتی زیاتر فێربن، دایکیشیان ڕێگەی پێدان و ئەوانیش مانەوە.

کوڕەکان زۆر دڵخۆش بوون بەوەی هەموو پرسیارێکیان لە زاناکە دەکرد و وەڵامی تەواوی پرسیارەکانیشیان وەردەگرتەوەو وەڵامەکانیش دڵ ڕازیکەر بوون.

بەڵام پاش ماوەیەك بێزاربوون هەر بۆیە بیریان کردەوەو بەخۆیان ووت دەبێ ئەم جارە پرسیارێك بدۆزینەوەو لە زاناکەی بکەین کە نەزانێت وەڵامەکەی چییە.

یەکێك لە براکان وتی: دۆزیمەوە، ئەزانم چییە...

پەپولەیەك ئەخەمە نێو دەستمەوەو لە زاناکە ئەپرسم لە نێو دەستم پەپولەیەك هەیە زیندووە یان مردووە؟

گەر بڵێ مردووە ئەوە دەستم ئەکەمەوەو پەپولەکە ئازاد دەکەم، بشڵێ زیندووە ئەوە بە ئەسپایی دەستم توند دەکەم و پەپولەکە دەکوژم، هەرچی بێت وەڵامەکەی هەڵە دەردەچێ.

بەرەو لای زاناکە ڕۆشتن و یەکێکیان دەستی داخراوی بەرەو ڕووی زاناکە درێژ کردو پرسی:

لە ناو دەستم پەپولەیەك هەیە، مردووە یان زیندوو؟

زاناکە بۆ ماوەیەکی درێژ لە چاوی کوڕەکەی ڕوانی و پاشان وەڵامی دایەوە:

بە دەستی خۆتە کوڕەکەم، بە دەستی خۆتە...

خۆشەویستیت
داهاتووت
گەنجێتیت
ژیانت
هەموو هەبونێکت
بەختەوەریت
خۆشحاڵیت
هەمووی بە دەستی خۆتە.....





مرۆڤ بەشێوەیەکی گشتی ئەوەندەی بەدوای عەیبی خەڵکدا دەگەڕێت بەدوای عەیبی خۆیدا ناگەڕێت بە تایبەت لەم سەردەمەدا، هەیە بەدوای عەیبی خەڵکی تردا دەگەڕێ، یان ڕەخنەیەك دەگرێ دواتر لێی پەشیمان دەبێتەوە، یان هەیە تەنها بۆ ئەوەی دەرکەوێت لەناو جەماعەتەکەیدا زۆر بەوردی بەدوای عەیبێکی هاوڕێکەی خۆیدا دەگەڕێ ، زۆرجاریش بینیومانە کەسانێك کە لەناکاو ڕەخنەیەکی سەیر دەگرن دوای ڕەخنەگرتنەکەیان ڕاستەوخۆ یان پەشیمان دەبنەوە یان قسەیەکی تر دەکەن، بۆ ئەوەی وای پیشان بدەن لێیان تیکچووە یان شۆخیان کردووە، ئەمانە بەوردی بەدوای عەیبی خەڵکیدا دەگەڕێن، بۆیە هەر کە چاویان بەشتێکی نامۆ کەوت دەیکەن بەعەیب و جێگەی ڕەخنەو تیرو توانج، ئیتر هەرچی بێت و ئاکامەکەی بە چی دەگات لایان گرنگ نییە.

دەگێڕنەوە کوڕێك قژی هەندێ درێژ بوو و نیوەی لول بوو، ڕۆژانە دەبوایە ماوەیەکی باش خەریکی قژداهێنان و جیڵ لێدان و جوانکاری کردنی بوایە تا کەمێك ڕێك دەبوو، بەیانییەك کەسێك لەدەرگای ماڵەکەی دا، هێشتا قژ نیوە لولەکە لەخەو هەڵنەستاوە و قژەکەشی بەو بەیانییە خودا دەزانێ چی لێهاتووە و چۆن ئاڵۆزو پەرت بووە، بە دەنگی دەرگاکەوە لەخەو هەڵدەستێ، ئەویش خێرا دەرگاکە دەکاتەوە و بەدەرگا لێدەرەکە دەڵێت: چییەو بۆچی هاتووی؟ ئەویش پێیدەڵێت: ویستم ئاگادارتان بکەمەوە کە ئاوێکی زۆر لەماڵەکەتانەوە دێتە دەرەوە بێ ئەوەی ئیشی پێ بکەن و بە فیڕۆ دەچێت، ئەمەش گوناهە و دەبێتە هۆی ئەوەی مافی خەڵکانی تر بخۆن!

بەڵام کوڕەکە بێ هیچ بیکردنەوەیەك وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ: بڕۆ جارێ قژی خۆت چاك بکە ئینجا وەرە پێمان بڵێ ئاوەکە بگرنەوە! ئەوەی لە بیرچووە کە خۆی قژێکی هەیە نیوەی لول ونارێکە و شانەشی نەکردووە، بەڵام پیاوەکەی تر ئاقڵتر بوو و وەڵامی نەدایەوە و ڕۆیشت، کاتێ کوڕەکە گەڕایەوەو سەیری ئاوێنەی کرد ئەنجا تێگەیشت کە خۆی ماڵەکەی لە شوشەیەو خراپە بەرد بگرێتە ماڵی خەڵکی تر، عەیبێك لەخەڵك نەگریت کاتێك خۆت عەیبداریت..

هەروەك وتراوە: لەدەرگای کێ بدەیت لەدەرگات دەدرێتەوە ، بۆیە دەبێ بزانین کە عەیبە لەهەر کەسێك بگرین ئەوە عەیبمان لێ دەگیرێتەوە ، بۆیە با خۆمان لەو کارو ڕەفتارە بپارێزین و خەریکی کاری چاك بین، با عەیبی خۆمان ڕێگرمان بێت لەوەی باسی عەیبی خەڵکی تر بکەین.

مرۆڤەکان کەم و زۆر خێریان تێدایە، پێش ئەوەی گومانی خراپیان پێ بەریت و عەیبیان لێبگریت، گومانی چاکیان پێ بەرە، ئەوەتا پێغەمبەری خودا (درودی خودای لەسەر بێت) کاتێ کەسێك تاوانێکی ئەنجامدەدا، لەپێشدا سەیری لایەنە باشەکەی ئەو کەسەی دەکرد، نەك لایەنی خراپ و تاوان و شەڕانگێزیەکەی، گومانی خراپی بەکەس نەدەبرد و خەڵکی بەکوڕ و کچ و برا و خوشکی خۆی دەزانی و بەجوانترین شێوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکردن، هەروەها عەباس دەڵێ: پێغەمبەری ئازیز (درودی خودای لەسەر بێت) فەرموویەتی: هەرکەسێك عەیبی برا مسوڵمانەکەی پەردەپۆش بکات، ئەوا خودای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا عەیبی ئەو پەردەپۆش دەکات، هەرکەسێکیش عەیبی برا مسوڵمانەکەی هەڵماڵێت و ئاشکرای بکات ئەوا خودای گەورەش عەیبی ئەو هەڵدەماڵێت و ئاشکرای دەکات هەتا لەناو ماڵی خۆیدا ئابڕووی دەبات.

لە کاتی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ خەڵکیدا، دادپەروەربە و چاکەو جوانیەکانیان بخەرە ڕوو بەڵام مەڵێ فلان ئەو عەیبەی هەیە و فیسارە ئەو عەیبەی هەیە، یان کارێك مەکە هەستیان بریندار بکەیت، بەهۆی خراپەکانیانەوە چاکەکانیان لەیاد مەکە و هەر خۆشت بوێن و وەڵامی خراپە بە خراپە مەدەوە، ئەگەر ویستت جێگای خۆت لەدڵی خەڵکی بکەیتەوە، ئەوا ئەوکارە وایان لێدەکات لەناو دڵی خۆیاندا جێگایەکی جوانت بۆ هەڵبژێرن.

لەکۆتاییدا دەڵێم: پێش ئەوەی دەست بکەیت بەهەڵکێشانی ڕەگ و شکاندنی درەختی شەڕو خراپە و گەڕان بە دوای عەیبی خەڵکیدا، بگەڕێ بەدوای درەختی خێر و چاکەکانیاندا و تێر ئاویان بکە.



# ئەرێ هەرێمی کوردستان لە بازنەی قەیراندایە یان لەسەیراندایە!؟

عەلی ئیبراهیم حەسەن

زۆرجـــار دەبـیـنـیـن لـەکـەناڵـە تەلەفزیۆنیەکان گفتوگۆی تێروتەسەل دەکـرێ لـەسـەر ئـەوەی ئـایـا هـەرێـمـی کوردستان لە قـەیـران و کێشەدایە؟!یان بـارودۆخـی زۆر ئـارامـەو شوێنی سەیران و گەشتاریە؟! لەوەڵامدا دەڵێین هەرێمی کوردستان بارودۆخەکەی (رێژەییە)ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ ناوەڕاست و خواروی عێراق ئەوا هەرێمی کوردستان لە رووی ئارامی وئاوەدانی و گەشەسەندنی ئابوری بەرێژەیەکی باش بارودۆخەکە باشترە!؟ بەڵام ئەگەر وردتر وەڵام بدەینەوە دەڵێین هەرێمی کوردستان لـەبـەردەم ژمارەیەك قەیراندایە!؟

یەکەم/ قەیرانی سەرکردە

سـەرکـردە وەکـو (سـەر وایـە بۆ لاشە) گەورەترین قەیران لە حیزبی کوردی و لە حکومڕانی و فەرمانڕەوایی کوردی لەخودی سـەرکـردە خـۆی دەنـوێـنـێـت!؟ سـەرکـردە مرۆڤە نەخۆش دەکەوێت!؟ ئیفلیج دەبێت!؟ جـەڵـدەی دڵ و مێشکی تـووش دەبێت!؟ سەرکرە هەڵە دەکات!؟ سەرکردە دەمرێت!؟

کـەواتـە پێویستە لە هـەر حزبێك چ عەلمانی بێت یاخود ئیسلامی، بە وردی هەڵوێستە بکرێت، بزانن دەزگایەك یاخود پەیمانگایەکی باڵا هەبێت، بۆ پێگەیاندنی (سەرکردە) ئایا خودی کەسە یەکەمەکان بەجدی کار لەسەر ئەوە دەکەن بۆ دوای خۆیان دەیاها سەرکردەی بە ئەزموون و شـارەزا دروسـت بکەن!؟ یاخود تەنها کار لەسەر ئەوە دەکرێت کە سەرکردە (تەقدیس و پیرۆز و مەزن) بکرێت!؟

بـۆیـە دەبـێـت کـورد دەیـەهـا بـەدیـل وجێگرەوەی هەبێت بۆ شوێنی (سـەرۆك کۆمار،سەرۆك وەزیران، سەرۆك هەرێم،... هتد) بەداخەوە ئەوەی لە هەندێك لە دەزگا راگەیاندنەکان پەخش دەکرێت کە ئەگەر فلانە سەرکردە بڕوات یان بمرێت!؟ جگە لە شڵەژان و بێ ئومێدی هیچ بەدیل و هیچ جێگرەوەیەك ناخەنە روو !؟ ئەمە خۆی گەورەترین قەیرانە!؟ چونکە لە هەرێمی کوردستان ئەگەر زەمینە سـازی بکرێت هەزارەها سەرکردە دەتوانرێت ئامادەبکرێت چ لە بەغداد یاخود لە هەرێمی کوردستان!؟

بەڵام پێویستی بەوە هەیە ئیرادە هەبێ، سەرکردایەتی بۆ چەند کەس و خانەوادەیەك تاپۆ نەکرێت، میلەتی کورد گەنج و لاوی خوێندەوار و رۆشنبیر و بەئەزموونی زۆری هەیە تا بتوانرێت سەرکردەی لێهاتووی بۆ نەتەوە و نیشتیمانی لێ ئامادەبکرێت.

دووەم/ قەیرانی بەرپرس و راوێژکار و بەڕێوەبەری دڵسۆز

دەگێرنـەوە لە سـەردەمـی شـای ئێران رۆژنامەنوسێك لە شا دەپرسێت (ئەرێ تا چەند میللەت و جـەمـاوەر تۆیان خۆش دەوێت و ئینتیمایان بۆت هەیە !؟ لە وەڵامدا شا دەڵێت (هەموو گەل و جەماوەری ئێران رۆح و گیانیان لەگەڵ مندان!؟) دوای راپەڕین و شۆڕشە جـەمـاوەریـە سەرتاسەریەکەی ئێران و هەڵاتنی شا بۆ وڵاتی میسر هەمان رۆژنامەنووس هەمان پرسیاری لێ دەکات بەڵام ئەمجارەیان وەڵامەکەی شا بەجۆرێکی تر دەبێت ودەڵێت (بەرپرس و مەسئولەکان منیان روخاند!؟)

أ- ئەوەی لە بەهاری عەرەبی پێویستە کـورد و سـەرکردەکانی پەندو وانـەی لێ

وەربگرن بریتی بوو لە گەندەڵی بەرپرس و مەسئولەکانی دەوروبەری نزیکی (زین العابدین و حسنی مبارەك و قەزافی و علی عبدالله صالح و ئەسەد و ... تاد) بۆ نمونە لە تونس زین العابدین بەرپرسە نزیکەکانی بریتی بوون لە خزمی نزیك و زاوا و برازا و بازرگانی بێ ویژدان و هی حسنی مبارك جمال و عەلای کوڕی، ئەوانی تریش بەهەمان شێوە!؟ ئەگەر سەرکردەکان چەند پێوەرێك دانەنێن بۆ دیاریکردنی بەرپرس وەك پێوەری (دڵسۆزی، دەستپاکی،شارەزایی،رەوشت بەرزی، خەمی خەڵك، ... تاد) تووشی هەمان دەردی (شا) و سەرکردەکانی بەهاری عەرەبی دەبن!؟ لە بیرمان نەچێت شای ئێران جوانی وت (مەسئولەکان منیان روخاند) بە راپۆرتی ناراست و بە ماستاوچێتی و قوربان قوربان و بازرگانی کردن بە فرمێسکی میللەت!؟

ب- چۆن راوێژکار حکومەت و سەرۆکی وڵات دەروخێنێت

جارێکیان مامۆستایەکی زانکۆ سیمینارێکی هەبوو منیش بەشدار بووم چەند قسەیەکی زۆر بەنرخی کرد بۆ مێژوو من لێرەدا دووبارەی دەکەمەوە گوتی (ئێستا دایکم ٨٥ ساڵە و نەخوێندەوارە بیبەمە ئەمریکا و لە شوێنی (سەرۆك ئۆباما) داینێم وڵاتی ئەمریکا بەڕێوە دەبات!؟ بەشداربوانی سیمینارەکە زۆر سەرسام بوون!؟ دواتر گوتی لە ئەمریکا (راوێژکاران)وڵات بەڕێوە دەبەن!؟

هەر هەمان مامۆستای زانکۆ قسەیەکی تری کردو گوتی (لەگەڵ بەرپرسی یەکێك لەم حزبانەی کوردستان باسی ئەوەم کرد پێویستە راوێژکارتان هەبێت ئەویش گوتویەتی کاوێژکارمان بۆچی یە!؟

بەداخەوە لە هەرێمی کوردستان راوێژکار لەهەموو وەزارەت و دەزگایەك هەیە بەڵام لەسەر بنەمای پێوەری زانستی و لێهاتووی دانەمەزراون !؟ وەزیری وا هەیە ماوەی چوار ساڵ چوار قسەو پرۆژەی لە راوێژکاران وەرنەگرتووە!؟هیچ هەڵسەنگاندن و بەدواداچوون نیە بۆ راوێژکارانی حکومەت و پەرلەمان ئایا بەرامبەر ئەو موچە بەرزە چ پێشکەش بە پەرلەمان و حکومەت و میللەتی کورد دەکەن !؟هێشتا چارەسەری راوێژکارمان نەکردبوو داهێنەرانی وەزارەتی رۆشنبیریشی هاتە سەر !؟ بۆیە پێویستە راوێژکار راوێژکار بێت و خاوەن پرۆژە و پێشنیار بێت و جێگە پەنجەی بە بڕیارەکانەوە دیاربێت!؟

ج- چۆن بەڕێوەبەر حکومەت دەروخێنێت!؟

کۆبونەوەکانی بەڕێوەبەران لە وڵاتی ژاپۆن دوای دەوام دەکرێت، ئەگەر بەڕێوەبەر بە ئیفاد بڕوات دەستەڵاتی خۆی دەداتە یاریدەدەرەکەی!؟ بەڵام لە هەرێمی کوردستان لەگەرمەی دەوامدا زۆربەی بەڕێوەبەرەکان کۆبونەوەیان هەیە،میوانیان هەیە،ئیفادن، لە دەورەی تەتویرن!؟

کێشەی زۆری حکومەت و وەزارەتەکان بریتیە لەوەی بەڕێوەبەری کارگێری شارەزاو و لێهاتومان زۆر کەمە، بۆیە پێویستە وەزیر و بەڕێوەبەرە گشتیەکان بەوردی کار لەسەر بەڕێوەبەرکان بکەن، تا هاوڵاتیان ئیش و کاریان لەدەزگاو فەرمانگەکان بە هەفتەو مانگ دوانەکەوێت،لەبەر کۆبونەوە و ئیفادی بەڕێوەبەرە بەڕێزەکان.

سێیەم : قەیرانی بازرگانی و خۆت بگرە لیژنەکە هات!؟

بەرنامەی لیژنەکە هات لەکەناڵی ئاسمانی زاگرۆس، ئەو راستیەمان پێدەڵێت:

أ- لەکابینەی یەکەمی حکومەتی هەرێم تا کابینەی شەشەم بەدواداچوون و چاودێری زۆر کەمبووە یاخود هەر نەبووە، پەرلەمان تا ئەم خولەی ئێستا کەمێك چالاکە،دەنا ئەندامانی پەرلەمانی خولەکانی پێشوو هیچ وەڵامی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان دەدەنەوە کە چەندین ساڵە ئەو هەموو خۆراکە خراپە و بەسەرچووە دەرخواردی خەڵکی کوردستان دراوە، بۆچی بەدوادا چون و هەڵوێستێکیان نەبووە،ئەرێ مەعقولە ئەو هەموو کارگە و کۆگاو دەرمانخانانە لە هەرێمی کوردستان و ئەوە بیست ساڵە بە هەزارەها تەن دەرمانی ئێکسپایەر و خراپیان دەرخواردی خەڵکی کوردستان داوە،بۆچی لیژنەی تەندروستی پەرلەمان لە ساڵی ١٩٩٢ تا ئێستا بەدواداچوون و پرۆژەو پێشنیارێکی نەبووە،ئەی خێرە تا کابینەی حەوت حکومەت وەزارەتی تەندروستی کارێکی بەرچاوی وای نەکرد، سنورێك بۆ ئەو بازرگانانە دابنرێت کە برادەرێك پێی گوتم لە غازی عەنتاب لە تورکیا بازرگانێکی تورك کە کاری دەرمان دەکات گوتی (وەڵا عەلی حسن مجید بەقەد بازرگانی دەرمانی کورد ژەهریان دەرخواردی کورد نەداوە!؟) داتا و ئامارەکان شاهێدن شێرپەنجە و نەخۆشی چۆن رۆژ لەدوای رۆژ تەشەنەی کردووە.

چوارەم/ بودجەی هەرێم و عەجائیبی سەبعە!؟

چەندین ساڵە بودجە دواخراوەو بەبیانووی جیاواز بەڵام لە ساڵی رابردوو هەندێ لە ئەندامانی پەرلەمان گوتیان لە پێناسەی زانستی بودجە کە کتێبەکانی ژمێریاری حکومی هاتووە، بودجە بریتیە لە خەملاندنی خەرجی و داهاتی یەك ساڵە،ئینجا بەرپرسانی دارایی دوای مشتومڕێکی زۆر گوتیان دەکرێت بودجە بەرێ بکرێت مادام بودجە خۆی تەخمینە.

پرسیارەکە ئەوەیە بۆچی بەرپرسانی وەزارەتی دارایی چەندین ساڵە بودجەیان دواخست و بەبیانوی پەسەندکردنی بودجە لە بەغداد لەگەڵ ئەوەی بۆ جارێکیش بەرپرسانی دارایی کتێبی محاسبە حکومیە یان بخوێندباوە،بە روونی پێناسەی بودجەی بە تەخمینی کردووە،یا خود بۆچی پەرلەمانتارێك یاخود بەرپرسێك ناپرسێ ئەو هەموو جیاوازیە چی یە،لەنێوان قسەکانی بەڕێز فازڵ نەبی وەکلیی وەزیری حکومەتی بەغداد و بەڕێز بایز تاڵەبانی و تاهیر رەشید لە وەزارەتی دارایی حکومەتی هەرێم!؟ هەموو ساڵێك لەکاتی بودجە کاك فازڵ نەبی دەڵێت رێژەی بودجەی هەرێم ١٧٪ یە، ئەگەر لە ١٧٪ نەبێت چۆن کوتلەکانی دەوڵەتی یاسا داوای کەمکردنەوەی دەکەن، بەرپرسانی دارایی هەرێمیش دەڵێن لە ١٠٪ یە و لە ١١٪ زیاتر نیە،خۆزگە رێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و دەزگاکانی راگەیاندن بە ووردی کار لەسەر ئەم قەیرانانە بکەن!؟

لە کۆتاییدا دەڵێین دەیەها قەیرانی تر هەیە هیوادارم بەرپرسانی دڵسۆز لە هەرێمی کوردستان بە ئیرادەیەکی پۆڵایین قەیرانەکان دەستنیشان بکەن و بەدەستەڵات و ئۆپۆزسیۆن و دەزگاکانی راگەیاندن و کۆمەڵگای مەدەنی ومامۆستایانی زانکۆ و مامۆستایانی ئاینی و پەرلەمانتارانی خەمخۆر بە جدی سنورێك بۆ ئەو نەهامەتی و کاولکاریانە دابنێن چونکە لە بیرمان نەچێت هەمومان لەیەك کەشتیدایین، تکایە با کاربکەین پێش ئەوەی کەشتیەکەمان نقوم و نغرۆ بێت.

دیار بەکر

# شیکاری کەسایەتیت بکە... پاشان ڕۆڵی خۆت ببینە



بەڕێزان ئێمەی مرۆڤەکان لەو ساتەوەی کە هەستمان بەبوونی خۆمان کرد لە ناو خێزان و کۆمەڵگەکەمان، لەو ساتەوەی بیری گەڕان بەدوای نهێنییەکانی ژیان دەبنە خولیامان، لەو ساتەوەی کە جیاکردنەوەی باش لە خراپ و جوانی لە ناشیرینی یەکان دە بنە ئامانجمان، لەو ساتەوەی هەوڵدانمان بۆ گەیشتن بەخودی حەقیقەت و دۆزینەوەی ڕاستی یەکان و بەدەستهێنانی باشترینەکان دەبنە حەزوو ئارەزووومان، لەو ساتەوەی ووردو درشتی شتەکان دەبنە جێی پرسیارو ئێمەش دەمانەوێت بەهەموویان بگەین چونکە خودی مرۆڤ بونەوەرێکی بزۆك و سەرەڕۆیە دەیەوێت مومارەسەی تەواوی شتەکان بکات لە ماوەیەکی زۆرکەم و کورت و دیاری کراودا. لەم دۆخەدا پێویستە هەڵوێستەیەك بکەین و بوەستین، جارێکی دیکە بەخۆمان و کەسایەتی و هەڵوێستماندا بچینەوە بەرامبەر خودی خۆمان و خێزان و دواجار کۆی کۆمەڵگەکەشمان، پێویستە جارێکی دیکە بەشێوەیەکی ورد ترو ژیرانە تر بۆ بابەت و پرسە جیاوازەکانی ژیان بەگشتی هەنگاو بنێین، بەڵام ئەمەش هەروا بە ئاسانی بەدەست نایەت بەڵکو دەبێت بەر لە هەمووشتێك هەڵسەنگاندنێکی تەواو بۆ خودی خۆمان بکەین بەشێوەیەکی گشتی، سەرەتاش دەبێت وەڵامی چواربابەتی گرنگ و هەستیار بدەینەوە چونکە هەریەکە لە و بابەتانە کاریگەری تایبەتی خۆی هەیە لەسەرمان و ڕۆڵێکی گەورەی هەیە لە ئاراستەکردنمان بەرەو کایە جیاوازەکانی کۆمەڵگە، هەروەك دیاری کردنی هەریەك لەو بابەتانە بۆخۆی ڕاڤەی بەشێکە لە کەسایەتیمان، هەروەها لە لایەکی دیکەوە وەڵام دانەوەی ئەم پرسانە بۆئێمە ڕۆشنترکردنەوەی ڕێگاکەیە، بەواتایەکی دیکە هەرکات توانیمان ئەم بابەتە گرنگانە وەك خودی خۆیان ڕاڤە بکەین ئەوا بێگومان لە کۆمەڵگەشدا بە شێوەیەکی تەندروست و سەرکەوتووانە ژیان بەڕێدەکەین هەروەك دەتوانین دەورو بەرمان بە شێوەیەکی سەرنج ڕاکێش بۆلای خۆمان کەمەندکێش بکەین.

**ئەو بابەت و پرسە گرنگانەی کە دەبێت لە ڕێیانەوە شیکاری کە سایەتیمان بکەین بە کورتی:**

١- ئێمە کێین؟: پێویستە بەرلەوەی هەنگاو بنێین بۆ ناسینی دەوروبەر و گەڕان بەدوای نهێنی یەکانی بووندا یەکەم هەنگاومان بەرەو خودی خۆمان هەڵگرین و سەرەتا خۆمان بناسین بە هەموو ماناکان، واتە دەبێت سەرەتا بۆ ئەو نهێنی یانە بگەڕێین کە لەناو خودی خۆماندا بەشاراوەیی ماونەتەوە، هەروەها دەبێت بزانین بۆچی هاتووین، ماف و ئەرکمان چی یە لە ناو خێزان و کۆمەڵگەدا هەروەك دەبێت بزانین پەیاممان چی یە، هەرکات توانیمان وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەینەوە کەواتە توانیمان ڕاڤەی خۆمان بکەین و بگەینە بابەتێکی گرنگ ئەویش خود ناسی یە، کەواتە لەم خاڵەوە دەگەینە ئەو ڕاستی یەی کە (خود ناسین یەکەمین ئەرك و خاڵی دەستپێکی مرۆڤەکانە بەر لە ژیان و کۆمەڵگە ناسین)

٢- ناسین و دۆزینەوەی تواناکان: پاش ئەوەی کە خۆمان ناسی پێویستە هەنگاوی دووەم بنێین کە ئەویش ناسین و دۆزینەوەی تواناکانە، بە مانایەکی تر پێویستە ئەو وزە لەبن نەهاتووانە بدۆزینەوە کە لە ناخ و جەستەماندا بونیان هەیە و درکمان پێ نەکردوون، بۆ ئەوەی جارێکی دیکە ئەم دەریا پڕ لە وزەیەی کە هەمانە لە خزمەتی مرۆڤایەتیدا بەکار بهێنین، تاببینە چرا بۆ ڕێگا تاریکەکان، جا هەریەکە لە بوارە جیاوازو وزە تایبەتییەکەی خۆیدا کە بریتییە لە تواناکانی، کەواتە بەگشتی لەم خاڵەدا شتێك فێردەبین ئەویش (ناسین و دۆزینەوەی تواناکان گرنگترین کارێکە کە پێویستە ئەنجامی بدەین بەر لە هەر جموجوڵ و هەنگاوێك).

٣- ئاستی ژیری... ئاستی ڕۆشنبیری: ئەم دووپرسە گرنگە پڕبایەخەش یەکێکە لە بابەتە گرنگەکان کە بەردەوام ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە ژیانی هەریەکەماندا بە جۆرێك چۆنێتی ڕوانینمان بۆ ژیان لە لایەك و ئاراستەکردنمان لە ژیاندا لە لایەکی دیکەوە دەردەخات؛ کەواتە پێویستە لەسەرمان ئاستی ژیریمان هەڵبسەنگێنین بۆ ئەوەی لە هەورازو نشێوییەکانی ژیان و ئاستەنگەکانی ڕۆژگار بەپێی ئاستی ژیریمان ڕاڤەبکەین و بەو شێوەیەی کەهەیە ڕووبەڕویان ببینەوە، هەروەها پێویستە ئاستی ڕۆشنبیریمان هەڵبسەنگێنین بۆ ئەوەی نەکەوینە هەڵەوە لە چۆنێتی مامەڵەمان لەگەڵ بابەتە جۆراوجۆرەکان، هەروەك پێویستە بە پێی ئاستی ڕۆشنبیریمان خۆمان لە قەرەی کایە جیاوازەکان بدەین بۆ ئەوەی لەو چوارچێوەیەدا مامەڵەیەکی تەندروست لەگەڵ کۆمەڵگە و گەمە جۆراوجۆرەکانی ژیاندا بکەین.

٤- ناسین یاخود زانینی پلەی کۆمەڵایەتی لە سەر ئاستی خێزان و کۆمەڵگە:

دیاری کردن و ناسینی پلەی کۆمەڵایەتی یاخود درك کردن بە ئاست و پلەی کۆمەڵایەتی یەکێکە لە بابەت و ئەرکە هەرە گرنگەکانی هەریەکێك لە ئێمە، چونکە هەرکات پلەی کۆمەڵایەتی خۆمان زانی بەرچاو ڕونتر دەبین بەرامبەر کۆمەڵگە و مامەڵە و کارلێکە جیاوازە کۆمەڵایەتی یەکانیشمان بە شێوەیەکی تەندروستتر ڕێك دەخەین لە ژیاندا ئەمەش بێگومان خۆی لە خۆیدا سەرکەوتنە.

ئەم بنەمایانەی کە بەکورتی باسمان کرد هۆکاری سەرەکین بۆ شیکاری کەسایەتیمان بەڵام لە هەمان کاتدا دەبێت ئەوەش بزانین کە شیکاری کەسایەتیمان یاخود ناسینێکی زانستیانەی خود بۆچی و خزمەت بەچیمان دەکات، بۆیە دەڵێین هەتا خۆمان نەناسین ناتوانین ڕۆڵی خوازراو یاخود تەواو بگێڕین لە کۆمەڵگەدا هەروەها ناتوانین کارەکانمان هەروا بەسانایی بەڕێوەبەرین.

کەواتە پێویستە کەسایەتیمان بناسین چونکە: ئەوکات بۆمان دەردەکەوێت لەچی ئاستیکین لە کۆمەڵگەدا بەگشتی، هەروەها تێدەگەین لەو ڕاستییەی کە کام کۆڕ و کۆمەڵ یاخود کام توێژ لەگەڵ بیرو ڕاو کەسایەتیمان یەکدەگرنەوەو بەرژەوەندی یەکانمان لە کوێ دەستەبەر دەبن و لەکوێ توشی داڕوخان دەبین، لەهەمان کاتدا بۆمان دەردەکەوێت کە لەکام کایەی ژیان سەرکەوتووین و لەکام گۆشەی ژیان شکستمان خواردووە؛ شارەزادەبین لەچۆنێتی گەمەکردن لەگەڵ ژیان و بۆ هەموو خۆشی و ناخۆشی و کێشەو گرفت و کارلێك و بەرکەوتە جیاوازەکان وەڵامی ئامادە و شیاومان دەبێت؛ وە ناسینی خود نەخشە ڕێگایەکی زۆربەسودو هاوکارێکی گرنگە بۆ ڕووبەڕوبوونەوەی تەنگژەکان، کەواتە شیکاری کەسایەتی فاکتەرێکی بەهێزە بۆ بەختەوەر بوونی خۆمان و ئاسودەکردنی کەسانی دەوروبەرمان؛ دەبێت کاری لەسەربکەین چونکە دەبێت ئەو ڕاستی یە بزانین کە ژیان هەمیشە بەردەوام نابێت و مۆڵەتمان پێ نادات کە بەشێوەیەکی هەڕەمەکی پەیوەندی یەکانمان ببەستین و بەبێ بیرکردنەوە هەرکات ویستمان بیبچڕێنین، لە کۆتاییدا دەڵێین: بادەست پێ بکەین و پەلە بکەین لە خودناسی پێش هەرهەنگاویکی تر لە ژیانماندا، بەپێچەوانەوە شکست دەهێنین لە ژیانی خۆمان و دەبینە پاشکۆ لە کۆمەڵگەدا، چونکە ئەگەر مرۆڤ خۆی نەناسی هەرگیز لە کۆمەڵگەش تێناگات.



# چەند وتەیەکی جوان سەبارەت بەهاوڕێیەتی

ئا: ڕۆشنا صالح

- هاوڕێ ئەوکەسەیە کەگۆرانی ناودڵت بزانێ و بشتوانێ بیڵێتەوە کاتێ تۆ وشەکان لەبیر دەکەی.
- هاوڕێی ڕاستەقینە فرمێسکی یەکەمت دەبینێ و دووەمت دەسڕێتەوەو سێیەمت ڕادەوەستێنێ.
- هاوڕێکان وەك ئەستێرە وان دێن و دەڕۆن بەڵام ئەوەی کە دەمێنێتەوە ئەوەیە کە دەدرەوشێتەوە.
- هاوڕێ ئەوکەسەیە کەلەڕابردووت تێ بگات ،باوەڕی بەداهاتووت هەبێت و ئەمڕۆت قبوڵ بکات بەوشێوەیەی کەهەی.
- پیاسە کردن لەگەڵ هاوڕێیەك لەتاریکیدا باشترە لەپیاسەکردن بەتەنیایی لەڕووناکیدا.
- هاوڕێیەتی ئەوە نیە کێ بۆ زۆرترین ماوە دەناسی ، ئەوەیەکەکێ دێت و وهەرگیز بەجێت ناهێڵێت.
- بەڕاستی شتێکی سەرسوڕهێنەرە کاتێ دووکەسی نامۆ دەبن بەدووباشترین هاوڕێ ،بەڵام بەڕاستی ناخۆشە، کاتێ باشترین دووهاوڕێ دەبن بەدووکەسی نامۆ.
- هاوڕێی ڕاستەقینە ئازارەکان لەچاوت دەبینێ ، لەکاتێکدا ئەوانی تر هەموو بەزەردەخەنەت هەڵخەڵەتاون.
- هاوڕێی خراپ وەکو سێبەر وایە کاتێ کەدەدرەوشێتەوە لەگەڵتە بەڵام کاتێ بەرەو تاریکی دەڕۆی بەجێت دێڵێ.
- هاوڕێی ڕاستەقینە لەکاتی تەنگانە دەردەکەوێ.
- هاوڕێیەتی قورسترین شتە لەجیهان، بزانە ،شتێك نیە لەقوتابخانە فێری ببیت بەڵام ئەگەر لەمانای هاوڕێیەتی نەگەیشتی،تۆ بەڕاستی فێری هیچ نەبووی.
- هاوڕێی ڕاستەقینە ئەوکەسەیە کەبەرەو ڕووت دێت لەکاتێکداهەموو دونیا لێت دووردەکەوێتەوە.
- هاوڕێ باشەکان پەیوەندی ئێمەن بەژیان، بەڕابردوو دەمان بەستێتەوە و ڕێگامانن بەرەوداهاتوو کلیلی بیرمەندیمانن لەدونیای نەزانیندا.
- تەنیاگوڵێك باخچەی منە بەڵام تەنهاهاوڕێیەك دونیای منە.
- تەنیابەهەشت لەهاوڕێیەك باشترە کەبەڕاستی هاوڕێیە
- لەهاوڕێکەم خۆمێکی تر ئەدۆزمەوە
- هیچ ڕێگایەك لەگەڵ هاوڕێی باش درێژ نیە
- تەنیاهاوڕێ ڕاستەقینەکان پێتدەڵێن دەموچاو(ڕوو)ت پیسە
- دەرمانی پەنجا دووژمن تەنیا یەك هاوڕێیە
- باشترین ڕێگابۆتێکشکاندنی دووژمن ئەوەیە بیکەی بەهاوڕێ
- خۆشەویستی هاوڕێیەتی هەرگیز گەورەو بچووکی ،دەوڵەمەندی وهەژاری، جوانی وناشرینی، دووری ونزیکی،باشی وخراپی نابینی چونکە لەدڵەوەیە
- هەرگیز باسی خۆت مەکە،هاوڕێکانت پێویستیان پێ ی نیەو دووژمنەکانیشت باوەڕت پێ ناکەن
- گوێم بۆدەگری کاتێك کێشەم هەیە وەیارمەتیم دەدەی بۆ سڕینەوەی فرمێسکی ڕووم خەمەکانم وەلا دەنێی بەختەوەری لەشوێنی دادەنێی
- هاوڕێ ئەو کەسە نیە کەلەپێناوت خەڵك دەکوژێ هاوڕی ئەو کەسەیە کەلەپێناوت دەمرێ
- هاوڕێیەتی چیە ؟ دوو ڕووحە کەنیشتە جێی یەك جەستەن
- ناتوانین ئەوخۆشیانە لەبیر بکەین کەهەمان بوو، پێکەنین تائەوساتەی دەم وچاومان شین هەڵدەگەڕا گفتوگۆ سەبارەت بەوشتانەی خۆشیمان تیادا دەبینی هەرکەس ئێمەی ناسیبا،وای دەزانی شێتیت
- هاوڕێی خراپ پەرداخێك زەهر بوایە هەرگیز هیچ کەسێك نەی ئەخواردەوە ، بەڵام ئەفسوس زۆرێکمان ئەو زەهرە چۆتە خوێن مانەوەو ئالوودەی بووین.!

له دۆزینەوەی هاوڕێی باشدا قوربانی بدەو ماندووببە، چوون هاوڕێی باش یەکێکە لە کلیلە گرنگەکانی بەختەوەری و سەرفرازی دونیاو قیامەت..! هاوڕێی خراپ بەزیندوێتیت مردنت پێشکەش ئەکات. هاوڕێی باش مەئوای ئارامی یە لەو ساتانەی گێژەڵوکەی بارانی خەم بارگەت تێك و پێك ئەدات، کاتێ لادان و خراپەکان ڕووت تێ ئەکەن، هاوڕێی باش نەك هەر ژیانت پێشکەش ئەکات بەڵکو دوای مردنیشت نزات بۆ ئەکات و لە یادت ناکات و سەردانت ئەکات.!! هاوڕێی باش... ژیانە، ئومێدە،ئاسوودەیی یە، بەشێکە لە ئێمان..! هاوڕێی باش لە هەموو گەوهەرو سەرمایەکانی دونیا بەنرخترە، سەرمایەکان هەموویان بێ گیان و فانین، بەڵام هاوڕێ باشەکان ئێستاو داهاتوو قیامەتمان ڕۆشن ئەکەنەوە.

# وەرە دەرەوە لە ناخی خۆت

ئـایـا دەزانـــی تـۆ لـە هـەمـوو کـەس بایەخدارتری لەم ژیانە؟

بوەستەو کەمێ بیر بکەوە لە خۆت، دەزانی بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی هەر هەمووی هیچ کەسێکی تری وەکو تۆ نەبوە؟ نـەك هـەر ئـەوەنـدە بەڵکو لە داهاتووشدا کەسێکی تری وەکو تۆ دروست نابێتەوە.؟

تـۆ بـەرهـەمـی کـۆمـەڵێك فـاکـتـەری بۆماوەیی و پێکهاتەی جەستەیی و هەست و نەست (العقل اللاواعی والباطن) وشارەزایی و هەڵوێستە جیاجیاکانی لـەو شتانەی بەسەرتدا هاتوون، هەروەها تۆ بەرهەمی ئەو کات و شوێنەی کە تیایدا دەژی لەگەڵ هەموو ئەو توانا دیار و شاراوانەی کە لای تۆ دەست دەکەون.

لەهەمان کاتدا تۆ کاریگەریت هەیە لەسەر هەموو ئەو فاکتەرانەی سەرەوە، بگرە دەتوانی بەکاریشیان بهێنی و کۆنترۆڵیشیان بکەی و لەگەڵ خۆتیان بگونجێنی .

بەڵێ تۆ دەتوانی کۆنترۆڵی هەستەکانت بکەیت و بیرکردنەوەکانت ئاڕاستە بکەی و چارەنووست دیاری بکەیت، ئەویش بە بەکارهێنانی مێشکی خۆت بە شێوەیەکی ئەرێنیی.

تۆ پێکهاتووی لە جەستەو عەقل، ئەو عەقلەی تـۆش پێك دێـت لە دوو هێزی بـەیـەکـەوە گـونـجـاوی شـــارراوە (عەقلی شارراوەو عەقلی بەئاگا ) یان وەکو هەندێك پێی دەڵێن (هەست و نەست) یەکێ لەم دوو هێزە زەبەلاحێکە هەرگیز ناخەوێت کە عەقڵی شـارراوەیـە، بـەڵام عەقڵی بە ئاگا کاتێ دەخـەوێ هێزەکەی نامێنێ و کە بەخەبەریش هات هێزە ناوەخنیەکانی لە راددەبـــەدەر دەبـن، جا کاتێ هـەردوو ئەو زەبەلاحە بە هەماهەنگی کاردەکەن ئـەوا دەتوانن کاریگەریان هەبێت بەسەر هەموو هێزەکانی تری زانـراو و نەزانراو بەشێوەیەك کە دەتوانن بەکاریان بێنن و ئاڕاستەیان بکەن.

ئـەو شتە چیە کە دەتـەوێ بەدەستی بێنی؟ چیت دەوێـت داوابـکـە. یەکسەر زەبەلاحەکەی ناو فانۆسی عەلائەددین دێتە دەرودەڵـێـت: فەرمان بکە و لە خزمەتت دامــە، چیت دەوێـت مـن ئـامـادەم بۆتی ئەنجام بدەم.

بـۆیـە ئـیـــرادەکـەت رابـگـەیـەنـە و زەبـەلاحـەکـەی ناخت لـەخـەو هەستێنە، چونکە ئەو زۆر بەتواناترە لەوەی لە کارتۆنی (سندباد و عەلائەددین )ت بینیوە کە لە فانۆسەکە دێتە دەر، ئەوەی ناو فانۆسەکە ئەفسانەو خەیاڵە بـەڵام ئەو زەبەلاحەی لەناخی تۆدا نوستووە راستەقینەیە .

ئەگەر دەتەوێت سەرکەوتنت بنەخشێنی، هەر ئێستا هەستە لە خـەوی غەفڵەت و زەبەلاحەکەی ناخیشت هەستێنە ئەو کات ژیانێك بە دەست دێنی کە خۆت دەتەوێت، دە هەستە جیهان چاوەڕوانی تۆیە.



ئامادەکردنی
راهێنەر: زانا رۆستایی
(nh8037@gmail.com)

هەر یەك لە ئێمە لە ژیانی رۆژانەماندا روبەڕوی هەڵوێستی میوانداری دەبینەوە، جا بە شێوەی پێشوازی کردنمان لە میوان یان دەبینە میوانی کەسانی تر، ئەمەش کۆمەڵێك ئەتەکێت و نەریتی خۆی هەیەو پێویستە رەچاو بکرێت، تا بە رێکی و جوانی دەرکەوین. لە باسەکەماندا بە کورتی ئاماژە بە چەند خاڵێك دەدەین کە پێویستە لە ژیانی رۆژانەماندا لە میانەی سەردانی و پێشوازیماندا کاری لەسەر بکەین :

١- لەکاتی سەردانی کردندا پێویستە بایەخ بە روکەشی خۆت بدەیت لە پۆشاك و جل و بەرگ بە پێی ئەو شوێنەی کە بۆی دەچیت، بایەخ دانەکەشت میانڕەوانە بێت و زێدەڕۆیی تێدا نەکرێت.

٢- هەر کات سەردانیت کرد و داوەت نەکرابویت، پێویستە پێشتر مۆڵەت لە خاوەن ماڵ وەربگریت تا کاتی سەردانیت بۆ دیاری دەکەن و، بە شێوەیەکی ژیرانە بزانە تا چەند ئامادەباشیان تێدایە بۆ پێشوازی کردن، چاك وایە لە رێگای پەیوەندی تەلەفونیەوە کات دیاری بکرێت.

٣- هەر کات داوەت کرایت، پێویستە بە سوپاس و خۆشحاڵیەوە وەڵامی داوەتەکە بدەیتەوە.

٤- هەر کات باری تەندروستیت تەوا نەبوو، یان کێشەو گرفتێکت هاتە پێش، ئەوا بە شێوەیەکی جوان پۆزش بهێنەوە و داوای لێبوردن بکە، کە ناتوانیت ئامادەی ئەو داوەت و مەراسیمە بیت.

٥- لە میوانداریدا پێویستە لەکاتی دیاری کراودا بگەیتە شوێنی مەبەست، نەك زوتر کە خاوەن ماڵ ئامادەسازیان وەرنەگرتوە بۆ پێشوازی، یان درەنگتر کەببێتە مایەیی نیگەرانی.

٦- لەکاتی سەردانیدا بە گلەیی و گازندە دەست بە قسان مەکە، گەر سەرنج و تێبینیەکت هەبوو ئەوا لێزانانە دەری ببڕە.

٧- لەکاتی سەردانی کردنی خزمان و هاوەڵاندا، چاوەڕوانبە تا شوێنی پێشوازی و دانیشتنت بۆ دیاری دەکەن.

٨- لەکاتی قسەکردندا بە دەنگێکی نەرم و لەسەرخۆ بدوێ، نەك بە دەنگێکی بەرز، یان نزم ونەوی و چپەچپ.

٩- هەوڵبدە داوای شتیان لێ نەکەیت، وەك بەکارهێنانی تەلەفۆن یان هەر ئامێرێکی تر، مەگەر لەحاڵەتی زۆر پێویستدا، هەروەها دەستکاری دەزگاو ئامێرەکانی ماڵەکە مەکە، وەك تەلەفزیۆن، سەتەلایت،......تاد

١٠- ئەو خواردن و خواردنەوانەی پێشکەش دەکرێت قبوڵیان بکە، مەگەر جۆرە خواردن و خواردنەوەیەك لەگەڵ سروشت و تەندروستیتدا نەدەگونجا، ئەوا بە جوانی پۆزش بهێنەوەو داوای لێبوردن بکە.

١١- گەر رایان وەرگرتی سەبارەت بەخواردن و خواردنەوەکان و، خاوەن ماڵ سور بوو لەسەر ئەوە، ئەوا ئاساییە بە راشکاوی رای خۆت دەربڕیت حەزت لەچی خواردن و خواردنەوەیەکە، بە مەرجێك جێبەجێ کردنی ئەستەم نەبێت.

١٢- گەر کوپێك یان شتێك بەدەستەوە شکا یان تێك چوو، بەبێ مەبەست، ئەوا بەجوانی پۆزش بهێنەوەو نیگەرانی خۆت دەربڕە، دواتر بابەتەکە لە بیر بکە.

١٣- پێویستە لەگەڵ خێزان یان هاوەڵەکانتدا، پێشتر کاتی کۆتایی میوانداری دەستنیشان بکەن و لەکاتی دیاری کراودا ماڵئاوایی بکەن.

١٤- پێویستە کاتی گونجاو و شیاو دیاری بکەیت بۆ پێشوازی کردنی میوانەکانت، تا بتوانیت ئەرکی پێشوازی میوانداری بەچاکی جێبەجێ بکەیت.

١٥ — لەکاتی سەردانی نەخۆشدا، پێویستە ماوەی سەردانەکە کورت بێت و، چونکە نەخۆش پێویستی بە حەسانەوەو پشوودانە، هەروەها ناشێت پرسیاری تایبەت بە نەخۆشیەکەی لێ بکەیت، یان منداڵ لەگەڵ خۆتدا ببەیت.

١٦- لەکاتی میوانیدا پێویستە رێز لە حورمەتی ماڵەکە بگیرێت و، هاتووچۆ نەکرێت بە نێو ژوور و بەشەکانیدا، مەگەر خاوەن ماڵ داوات لێ بکات.

١٧- لەکاتی میوانداریدا ناشێت باس لە کەموکورتی خواردن و خواردنەوە، یان کاروباری ماڵەکە بکرێت، چونکە دەبێتە هۆی شەرمەزاری و نیگەرانی خاوەن ماڵەکە.

١٨- هەستان و کۆتایهێنان بە میوانداری لەکاتی گونجاودا، چونکە زۆر دانیشتن کار دەکاتە سەر ژیان و بەرنامەی خاوەن ماڵ و، پشو و حەسانەوەیان دەشێوێنێ.

١٩- رێزگرتنی میوان ئەرکێکی ئاینی و کۆمەڵایەتیە، بەڵام زۆر لەخۆ کردنێکی لەرادەبەدەر بۆ ئامادەکردنی خواردن و خواردنەوەو پێداویستیەکان، کارێکی باش و خوازراو نیەو، کار دەکاتە سەر بوجەی خێزان.

٢٠- پێویستە خاوەن ماڵ بوار بڕەخسێنێ بۆ میوانەکانی و خۆشی و شادی دەرببڕێ بە ئامادەبونیان و رەخساندنی کەشوهەوایەکی گونجاو و خۆش بۆ ئاخاوتن و گفتوگۆ.

٢١- پێشوازی کردنی جوان لە میوانەکان، وەك بەخێرهێنانیان و بانگکردنیان بە خۆشترین ناوەکانیانەوە و، رەخساندنی شوێنی گونجاو و باش بۆ دانیشتن و حەسانەوەو پێداویستیەکانیان.

٢٢- دەست وەرمەدە لە کاروباری تایبەتی خاوەن ماڵ و بە پرسیاری زۆر نیگەرانیان مەکە.

٢٣- ئامۆژگاری و رێنوێنی منداڵەکانت بکە، تا لە میوانداریدا رەچاوی ئادابی میوانداری بکەن و هەڵسوکەوتی نەشیاو و جوڵەجوڵ و دەنگەدەنگ نەکەن و، کەش و هەوای میواندارییەکە نەشێوێنن.

٢٤- چاك وایە لەگەڵ خۆتدا دیارییەك ببەیت، وەك چەپکەگوڵێك، یان شیرینی، یان هەر شتێکی تر، بەپێی نەریتی ئەو شوێنەی بۆی دەچیت.

# پشووی بەرەو

ئ: بەرەو

- ئافرەتی ژیر بیابان دەکات بەباخی رازاوە.
- ژیان فێری خۆشەویستیت دەکات، ئەزموون فێرت دەکات کێت خۆش بوێت، هەڵوێستەکان فێرت دەکات کێ خۆشتی دەوێت.
- گەر نەتتوانی قسەی هەق بکەیت، چەپڵە بۆ ناهەق لێ مەدە.
- رەوشت جوانی خراپەکانی مرۆڤ دەشارێتەوە، بەد رەوشتیش چاکەکان پەردە پۆش دەکات.
- بەرێزترین مرۆڤ کەسی لێبوردەیە، جوانترینیان کەسی بێ فیزە، دەوڵەمەند ترینیان کەسی قانیع و رازییە.
- خانەوادەکەم کاتی زۆریان بەسەر برد تافێری ئاخاوتنم بکەن، ئێستا خۆشم کاتێکی زۆر بەسەر دەبەم تافێری بێ دەنگی بم.
- خەڵکی هەڵدەرەوە وەك لاپەڕەکانی کتێب، لەسەر چاکەکانیان هەڵوێستە بکە، گەمژەکانیان لەبیر بکە، خراپەکانیان بدڕێنە.

- هاوڕێکەم خەم مەخۆ، ئەو بایەی دەرگایەکت لێ دادەخات، پێ دەچێت هەمان با دەرگایەکی ترت بۆ وا لا بکاتەوە.
- کاتێك ڕاست دەکەیت کەس باسی ناکات، بەڵام کاتێك هەڵە دەکەیت کەس لە بیری ناکات.
- ژیریت وەك باخچە وایە، یان گوڵی هیواو گەشبینی تێدا دەڕوێنی، یان پڕی دەکەیت لە دڕکو داڵی بێ ئومێدی و ڕەشبینی.





# ڕوانینمان لە ساڵی نوێ دا

د. ئەحمەد وەرتی
ئەندامی پەرلەمانی کوردستان
ahmadwerti@yahoo.com

کاتێك ئەم وتانەمان لە گۆڤارە ئازیزەکەی (برەو) دا دەخوێنیتەوە، پێمان ناوەتە ساڵێکی تر لە تەمەنمان، ساڵێکی نوێ و وەرزێکی تازە لە ژیانمان دەستی پێکردووە، هیوای لەشساغی و تەمەن درێژی و بەختەوەری بۆ هەموو خوێنەرانی بەرێز و هاو نیشتیمانیانم دەخوازم، لە ناخی دڵمەوە لە خودای گەورە داواکارم لە هەڵەو تاوانی هەموومان خۆش بێت و کارە باشەکانمان لێ وەرگرێت و ڕێنماییمان بکات بۆ هەر کارێك خێری خۆمان و میللەتەکەمان و مرۆڤایەتی تێدایە. کاتێك ساڵێك بەرێ دەکەین، پێویستە بە ڕابردوومانداا بچینەوەو بزانین:

١- لە ساڵی ڕابردوودا چیمان کردووە، چەند لە ئەرك و کارەکانمان ئەنجام داوەو چەندە بوێرانە و ڕاشکاوانەو ڕاستگۆیانە پەردەمان لاداوە لە سەر مەسەلەکان و ئاشکراکردنی ڕاستیەکان و بەرەنگاربوونەوەی گەندەڵیەکان.

٢- چەند لە خەون و هیواکانمان لەمساڵدا هاتنەدی؟ ئەوانی تر چۆن بەرنامەیان بۆ دابنێین؟!

چۆن بتوانین لە هەڵەکانی ڕابردوومان سوود وەرگرین و ڕق و کینەی دڵمان و فیزو خۆ بەزلزانینمان وەلاوە بنێین، چونکە هەرچەندە بەهێزو بلیمەت و خاوەن تواناو نفوز بین و چەندە هەڵپەمان بێت بۆ ژیانی دنیاو ڕاکردن بە شوێنیدا، دواجار هەر ئەبێ بمرین و ئەم جیهانە بەجێ بێڵین، کەوابوو تەنیا کاری چاکەو خزمەتکردنی خەڵك و پاکی و ڕاستی و دڵسۆزی چارەسەرەو لە هانای هەموومان دێت چ لەم دنیاو چ لەو دنیا..

٣- زۆر ڕاکردن بە دوای ژیانی دنیاو پارەو سامان و کۆشك و تەلار و دەوڵەمەندی و خۆ ماندووکردنی بێسنوور و تەنانەت بوونی دەسەڵات و حوکمڕانی نابێتە مایەی ئەنجامدانی هەموو کارەکانمان و خۆشبەختی و فەراهەم بوونی گشت ئاوات و خواستەکانمان، بەڵکو کەڵك وەرگرتنی خراپ لەمانە و زێدەڕۆیی تێیاندا دەبێتە مایەی نەگبەتی و پەشیمانی.

٤- ڕوانین بۆ ئایندە خەونێکی گەورەیە بۆ جوانکردن و باشترکردنی بارودۆخ و حاڵ و گوزەرانمان لە داهاتوودا، بۆیە دەبێ ڕوانین و ڕوئیایەکی ڕۆشنمان هەبێت کە مەبەست و خواستێکی ڕەوا و شیاو و گونجاوی لە خۆگرتبێت، ئەمەش هێزێکی هاندەر و کاریگەر بە مرۆڤ دەبەخشێت بۆ کارکردن و بەردەوامی و دەسکەوتی نوێ لە ئایندەیا، بێگومان ڕۆژانە ئێمە گوێبیستی دیدگاو ڕوانینی نوێ دەبین کە هەندێکیان هێزی خۆیان هەیە و مەرجی گۆڕانکاری و تەئسیرگوزاریان تێدایە، بۆ نموونە کۆمپانیایەك ڕیکلام بۆ کارو بەرنامەی داهاتووی خۆی دەکات و دەڵێت:(هەوڵدەدەین کۆمپانیاکەمان گوازەرەوەیەکی ئاسمانی ئاست بەرز بێت و گرنگی و بایەخی تەواو بدەین بە ڕێبوارەکان و فەرمانبەرانی)، یان بانکێك دەڵێت:( ئێمە هەوڵدەدەین بۆ جێبەجێکردنی بەرنامەی ئیسلام لە کارو بارو مامەڵەی بانکیماندا).. ئەمانە نموونەی بەهێزن بۆ سەرنجڕاکێشان و وروژاندن و کیشکردنی خەڵك بە لای خۆیاندا.

٥- ئەگەر ڕوانین و ڕوئیاکە مەبەست و خواستێکی ڕەواو دروستیش لە خۆبگرێت و ئامانجی وروژاندن و باشترکردنی بارودۆخ و گوزەران بێت لە داهاتوودا، دەبێ لە توانایدا بێت خەڵکی تری پێ قایل بکات، وە ئەگەر خاوەنی ڕوانینەکە سەرکردەیەك یان سەرکردایەتییەك بوو، دەبێ هەوڵبدات لە گەڵیا قەناعەت بە خەڵکانی دیکەو شوێنکەوتوانی بکات بۆ قبوڵکردنی ڕوانین و بەرنامەکەی بە شێوەیەك ببێتە موڵکی خۆیان بۆ ئەوەی هاریکاربن لە گەڵیداو بەشداربن لە جێبەجێکردنیدا ئیدی سەختی و ڕێگریەکان هەرچی بن.

٦- لە هەموو حاڵەتەکاندا، دەبێ کاتەکانمان بقۆزینەوەو ڕۆژو هەفتەو مانگ و ساڵەکانمان بە بەرنامەو ڕوانین و ئەجێندای ڕۆشن و دروست بەڕێبکەین و کارەکانمان ڕێکبخەین و ئایندەمان بە ڕوئیاو خەون و خولیاو کارو کۆششی جوان و باش و بەسوود بنەخشێنین بە سوود وەرگرتن لە ڕابردوو و پەند وەرگرتن لە هەڵەو ئەزموونەکانمان لە ساڵانی بووریدا.



# ڤایرۆسێکی لەناوبەرا!

ئارام نبی محمود

خۆ بەگەورەزانین دەردێکی کوشندەی مرۆڤایەتیە، سیفەتێکی شەیتانی و بێزراوە، ڤایرۆسێکە گشت باشیەکانی مرۆڤ لەناودەبات، کەچی دەبینین زۆربەی مرۆڤەکان لەم سەردەمەدا ئالودەی ئەم نەخۆشیە کوشندەیە بوون.

بۆیە پێویستە بزانین خۆبەگەورەزانین چیە؟ زیانەکانی چین؟ ئەی خۆبەگەورەزانین مرۆڤ بەرەو کوێ دەبات؟

لەم پەڕاوەدا بەرِوونی وەلامی ئەمانە بخوێنەرەوە و بەتەواوی بەچەمکی لوتبەرزی ئاشنا ببە!!، ئەمەش لەپێناو دوورکەوتنەوەمان لەو سیفەتە ناحەزە.

خۆبەگەورەزانین بەواتایەکی تر لوتبەرزی بەسیفەتێکی شەیتانی ناسراوە، چونکە شەیتان یەکەم کەس بوو کەسیفەتی لوتبەرزی لەخۆیدا بەرجەستەکرد، ئەمەش لەکاتێکدا بوو کەخوای گەورە دوای دروست کردنی ئادەم (علیه سلام) فەرمانی دا بەفریشتەکان کە کڕنوشی ڕێز بەرن بۆ ئادەم، هەموو فریشتەکان فەرمانی خوای گەورەیان بەجێهێنا جگە ئیبلیس نەبێت کەفەرمانی خوای گەورەی شکاند و وتی: ﴿قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ قَالَ أَنَا خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُ مِن طِينٍ ﴿١٢﴾﴾ الأعراف: ١٢

پێغەمبەری ئازیز (دروودی خوای لەسەربێت) لەپێناسەی خۆبەگەورەزانیندا فەرموویەتی: ((الكبر بطر الحق وغمط الناس)) رواه مسلم

واتە: خۆبەگەورەزانین بریتیە لەبەرپەچدانەوەی ڕاستی و پاشان بەبچووک زانینی خەڵك.

شەیتانیش هەمان کاری ئەنجامدا، ڕاستی ڕەت کردەوە و ئادەمیشی بەبچووك زانی، هەر مرۆڤێکیش بەقەد گەردیلەیەك لەدڵیدا خۆبەگەورەزانین هەبێت، ئەوا دەبێتە هاوڕێی شەیتان و قارون و هامان و فیرعەون و نەمروت) چونکە بەڕاستی ئەوانە بەپێشەوای ئەم سیفەتە ناحەز و نەویستراو و دۆزەخیە ناسراون.

ابن القیم لەپێناسەی خۆبەگەورەزانین دەفەرموێت: خۆبەگەورەزانین شوێنەوارێکە لەشوێنەوارەکانی سەرسام بوون بەنەفسی خۆت، لەدڵێکەوە دەردەچێت کەپڕیەتی لەنەزانی و نەفامی، کە ئەو کەسە لەبەندایەتی خوا دەردەکات و تووشی بێ ئومێدی دەکات، هەربۆیە ئەوکەسەی تووشی ئەم نەخۆشیە دەبێت زۆر بەکەم و بێ نرخ سەیری خەڵکی دەکات، کاتێك لەناویاندا ڕێ دەکات فەخریان بەسەردا دەکات، لەمامەڵەکردنیش لەگەڵ خەڵکیدا بەشێوەیەکە هیچ نەرم و نیانی و خۆشەویستی تێدا نیە، هەرگیز ئامادەنیە سەلام لەبەرامبەرەکانی بکات، بەڵکو هەردەبێت سەرەتا ئەوان سەلامی لێ بکەن، کاتێك لەگەڵ خەڵکی قسەدەکات زۆر سەیریان ناکات، هەروەها هیچ کات وانازانێ خەڵکی مافیان بەسەرەوە هەیە، کەچی لەبەرامبەریشدا مافی خۆی بەسەرهەموو کەسێکەوە دەبینێت!!، چاکەو پیاوەتی خۆی بەسەر هەموو کەسێکەوە دەبینێت، بەلام چاکەو پیاوەتی هیچ کەسێك بەسەرخۆیەوە هەست پێ ناکات.

نموونەی لوتبەرزی وەکو ئەو گوڵە گەنمانە وایە کەپوچن و گەنمیان تێدانیە، کەچی هەموو کات سەربەرز و باڵا درێژن، بەپێچەوانەی ئەو گوڵەگەنمانەی کەپڕن لەگەنم و سەنگین و گرانن، لەبەرامبەریشدا هەمیشە ملکەچ و ڕوولەزەوین.

خۆبەگەورەزانین ناخ و دەروونی مرۆڤەکان بەهیلاك دەبات و سەرەنجام زەلیلی و بچووکی و سەرشۆڕی و لەناوچوون دەکاتە خەلات بۆ خاوەنەکەی، مرۆڤەکان بەهۆی ئەو سیفەتەوە هەمیشە و بەردەوام دوورن لەخەڵکی، کەئەمەش دەبێتەهۆی کەنارگیری و هەست کردن بەخەمۆکی و دڵەڕاوکێ، ئەمانەش سەرەڕای ڕق و کینی خوای پەروەردگار لێیان، هەروەها ئەم سیفەتە مرۆڤ ڕووبەڕووی سزایەکی سەختی دۆزەخی دەکاتەوە و دووری دەخاتەوە لەمیهرەبانی و بەزەیی و بەهەشتی پەروەردگار، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخْتَالًا فَخُورًا ﴿٣٦﴾﴾ النساء: ٣٦

واتە: بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆش ناوێت کەخۆدەنوێنن و فیزدەکەن و فەخر دەفرۆشن بەسەر خەڵکیدا.

لەفەرموودەیەکی قودسیدا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) دەفەرموێت: خوای گەورە فەرمویەتی: گەورەیی و مەزنی بەرگ و پۆشاکی منە، هەرکەس بیەوێت یەکێك لەوانە لەمن بسەنێت و لێمی دابرنێت ئەوە هەڵی دەدەمە دۆزەخەوە.

سید قوتب دەڵێت: ئیسلام بیروباوەڕی گەورەیی و بالابوونە، تایبەتمەندیەك لەتایبەتمەندیەکانی ئیسلام بریتیە لەوەی کە لەگیانی باوەڕداردا هەستی عیزەت دروست دەکات بەبێ ئەوەی تووشی لوتبەرزی و خۆبەگەورەزانینی بکات، هەروەها گیانی متمانەبەخۆبوونی بۆ دروست دەکات بەبێ ئەوەی تووشی بێ ئومێدی بکات و سەرکەش بوون ڕووی تێ بکات.

خۆبەکەمزانین (تواضع)، لێبوردەیی، یارمەتیدانی خەڵك، قبوڵکردنی بەرامبەر وەکو خۆی، دڵ پاکی، نەرم و نیانی، بەخشینی خۆشەویستی بەوانی تر، ئەمانە تەواو پێچەوانەی لوتبەرزین، بۆیە هەمیشە و بەردەوام سیفەتی پێغەمبەران و پیاوچاکان و ڕاستگۆیان بووە.



# وێستگەکانی بەخۆداچوونەوە

شوان رابەر

ئیسلام کە بەرنامەی ژیانە چەندان کات و وێستگەی بە خۆداچوونەوەو گەڕانەوە لای خوای گەورە و تەوبەکردنی داناوە لە ژیانی ئینساندا، هەر کاتێك و لە هەر شوێنێك ئینسان بە خۆی دا بێتەوە و لە گوناهەکانی پەشیمان بێتەوە و بگەڕێتەوە لای خوای گەورە، دەرفەت و شتێکی باشە و خوای گەورە تەوبەی ڕاستوپاکی لێ قبول دەکا، نەخاسمە هەندێ کات و وێستگەی گشتی داناوە کە موسڵمانان سالانە لە یەك کاتدا دروشمێکی خوای گەورە ئەنجام دەدەن و بواری تەوبەکردنیان تێدا زۆرە کە ئەمانەن.

١- حەجکردن: روکنێکە لە روکنەکانی ئیسلام ، هەر کەسێ توانای ماددی و مانەوی هەبێ ، دەبێ لە ژیانی دا یەکجار سەردانی ماڵی خوای گەورە (بیت الله الحرام) بکات، لەوێ داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە دەکات و ڕوکنێك ئەنجام دەدات، ئەگەر خوای گەورە حەجەکەی لێ قبول بکا وەك و منالی ساوا وبێ گوناه دەگەڕێتەوە ماڵەوە، ئیتر حەجکردن خێر و پاداشتی زۆرە وکۆنگرەیەکی ساڵانەیە، بۆیە ساڵانە لە یەك کاتدا لە هەموو جیهان بە ملیۆنان کەس ڕوو لە ماڵی خوا دەکەنو ئەم فەریزەیە ئەنجام دەدەن.

٢- عومرەکردن: سونەتێکی بە خێرە، ساڵ دوازدە مانگ دەکرێ، ئینسان دەتوانی سەردانی مالی خوا بکا و لەوێ بگەڕێتەوە لای خوای گەورە وخواپەرستی ئەنجام بدات.

٣- جومعە: کۆبونەوەیەکی هەفتانەی موسڵمانانە، ئەگەر ئینسان هەندێ کاری چاك لە جومعەدا بکا دەبێتە کە فارەتی گوناهەکانی تا جومعەیەکی تر، لە هەمان کات وێستگەیەکە بۆ بەخۆداچونەوەو گەڕانەوە لای خوای گەورە.

٤- ڕەمەزان: ساڵانە موسڵمانان یەك مانگ لە ڕەمەزان بە ڕۆژو دەبن، ڕەمەزان خێر و بەرەکەتێکی زۆری تیایە، بواری تەوبەو چاکە و پاك بونەوەی تیادا زۆرە، ئینسان دەتوانێ بگەڕێتەوە لای خوای گەورە و لە گوناهەکانی تەوبە بکات.

٥- فەرزەکان: ئینسان لە شەوو ڕۆژێك پێنج نوێژی لەسەر فەرزو واجبە، دەتوانێ لە کاتی هەموو نوێژەکانی تەوبە بکا و بگەڕێتەوە لای خوای گەورە.

٦- سوننەتەکان: زۆر نوێژ هەن سوننەتن، ئەگەر ئینسان بیانکات دەتوانێ تیایاندا بە خۆیدا بێتەوە.

٧- سوننەتی ڕۆژو: لە هەر مانگێك چەندان ڕۆژ سوننەتە ئینسان بەڕۆژو بێ، وەك دووشەممە و پێنج شەممە و ١٣ و ١٤ و ١٥ ی هەموو مانگێكوجەندان ڕۆژی تر، دەتوانێ لەم ڕۆژانە بە خۆیدا بێتەوە.

٨- تەوبەکردن: هەر کاتێك ئینسان تەوبە بکا و بگەڕێتەوە لای خوای گەورە، بۆی هەیەو دەرگا والایە، کەواتە دەتوانێ بە گوناهو بێ گوناهکردن، بەردەوام تەوبە بکات و بگەڕێتەوە لای خوای گەورە.

ئیتر هەموو ئەوانەو زیاتریش وێستگەی بە خۆداچونەوەن بۆئینسان.

# 5 ڕێگا بۆ بەدەستهێنانی خۆشەویستی بەڕێوەبەرەکەت بدۆزەوە!



عبدالقهار بلباس qahar1980@gmail.com

شوێنی کار ماڵی دووەمی مرۆڤە لەبەر ئەوەی زۆربەی کاتەکانی لەوێ بەسەر دەبات، هەندێ جار ئەو کاتەی لە کارکردن بەسەری دەبات زیاترە لەوەی کە لەگەڵ ماڵ و خێزانیەتی، بۆیە مرۆڤ بەردەوام هەوڵ دەدات خۆشەویستی و ڕێزی بەڕێوەبەرەکەی لەسەر کار بەدەست بێنێت، لە هەمان کات ڕێزی هاوکارەکانی کە زۆر لە کاتەکانی لەگەڵ ئەوان بەسەر دەبات، لەبەر ئەوەی شوێنی کاری بێ بەش لە خۆشەویستی و ڕێز لە نێوان کەسەکان زیاتر لە زیندان دەچێت.

جا بۆ ئەوەی کەسێك بیەوێت خۆشەویستی و ڕێزی بەڕێوەبەری کارەکەی بەدەست بێنێت چەندین ڕێگە و شێواز بۆ ئەمە بەکار دێنێت، قێزەونترینیان دووڕوویی و خۆ نزیکردنەوەیە لە خودی بەڕێوەبەر بە شێوازێکی نا شایستە، بەڵام بێ ئاگا لەوەی لە جێگەی خۆشەویستی و متمانە ڕێزی خۆی لەبەرامبەر بەڕێوەبەر و هاوکارەکانی لە دەست دەدات.

بۆیە پێویستە بزانین ئەو ڕێگا دروستانە چین کە یارمەتیدەرە بۆ بە دەستهێنانی خۆشەویستی بەڕێوەبەری کار:

وردبینی: زۆرترین ئەو شتانەی کەسێك بیەوێت لە ڕێگەیەوە خۆشەویستی و ڕێزی بەڕێوەبەری کارەکەی بەدەست بێنێت بریتیە لە وردبینی لە کارەکان، وردبینی و ئەنجامدانی کارەکان بە باشترین شێوە خۆشەویستی و ڕێز لە دڵی بەڕێوەبەر دەچەسپێنێ، لەبەر ئەوەی خاوەن کار تەنها شتێك بیەوێت ئەوەیە کارەکەی بە باشترین و تەواوترین شێواز ئەنجام بدرێت، جا یەکێك بتوانێت ئەوە بێنێتە جێ و وردبین بێت لە کارەکەی و بەردەوام ئەرکی سەر شانی بە جوانترین شێوە و دوور لە کەم و کوڕی جێبەجێ بکات بێگومان شوێنێکی دیاری دەبێت لە دڵی بەڕێوەبەری کارەکەی.

٢- دان نان بە هەڵە: بێگومان هیچ کەس نیە بە بێ هەڵە، ئاساییە یەکێك لە کارەکەی ڕووبەڕووی هەڵە بێتەوە، لەوانەیە ئەوکات هەست بکات کە خۆشەویستی و ڕێزی بەڕێوەبەرەکەی لەدەستداوە، بەڵام ئەمە ڕاست نیە، لەبەر ئەوەی کەوتنە ناو هەڵە نەنگی نیە، بەڵکو نەنگی ئەوەیە کە لەسەر هەڵە بەردەوام بیت و دانی پێدا نەنێی، لەبەر ئەوەی کەسێك هەڵە بکات و دان بە هەڵەکەشی نەنێت لای بەڕێوەبەری کارەکەی بە کەسێکی ترسنۆك وێنا دەبێت کە ناتوانێت بەرپرسیارێتی هەڵەکانی لە ئەستۆ بگرێت، بەمەش پایەی خۆی لەلای ئەو لە دەست دەدات، بۆیە کاتێك یەکێك دەکەوێتە نێو هەڵە پێویستە لەبەردەم بەڕێوەبەرەکەی دانی پێدا بنێ هەتا ئەگەر هاتوو لەبەرامبەر ئەو هەڵەیە سزاش بدرێت، بەڵام لە بەرامبەردا ڕێز و شکۆی خۆی لای ئەو بەڕێوەبەرە بەدەست دێنێتەوە، وە کەسێك دەبێت لە جێگای متمانەی ئەو.

بوونی پەیوەندی باش: زۆر گرنگە پەیوەندی باش هەبێت لە نێوان کارمەند و بەڕێوەبەری کار، ئەم پەیوەندیە وا دەکات کارمەندەکە پێگەی بەڕێوەبەرەکەی بزانێت و لە گفتوگۆکردن لەگەڵی ڕێزی لێ بنێت بەبێ دووڕوویی کردن بۆی، وە لە هەمان کاتدا بەڕێوەبەریش بە هەمان شێوەی خۆی مامەڵەی لەگەڵ دەکات و ڕێزی دەگرێت. بوونی پەیوەندی باش لە میانەی ئەنجامدانی کار تەنها سوودبەخش نیە بۆ کارمەندەکە بە تەنها بۆ ئەوەی لای بەڕێوەبەرەکەی بە جوانی بێتە بەرچاو، بەڵکو سوودی بۆ خودی کارەکەش هەیە، لەبەر ئەوەی کەش و هەوای پێکەوە ژیان و پەیوەندی باش وا دەکات کارەکە بگاتە ترۆپکی سەرکەوتن.

٤- ڕێکخستن: کارمەندێك ئیش و کارەکانی بە ڕێکی ببات بەڕێوە شایستەی هەموو ڕێز و پێزانین و خۆشەویستیەکە لەلای بەڕێوەبەرەکەی، ئەو کارمەندە کاتێك ڕێڕەوی کارەکەی بەباشی دەزانێت و پارێزگاری لەسەر سیستەمی کارەکەی دەکات، بێگومان شوێنێکی تایبەتی لەلای بەڕێوەبەری کار دەبێت کە جەخت لەسەر بەڕێوەچوونی کارەکان دەکاتەوە بەشێوەیەکی ڕێك و گونجاو، ئەم ڕێك و پێکیەش دەبێتە مایەی دڵئارامی بۆ خودی کارمەندەکە و سەرکەوتنیش بۆ کارەکە.

٥- حەزی فێربوون: گرفتی گەورەی کارمەندان لەسەر کار ئەوەیە کە وای دەبینێت ئیتر ئەو کارامەیی تەواوی لە کارەکەی بە دەست هێناوە و پێویست بە فێربوونی هیچ شتێکی تر ناکات، بۆیە کاتێك بەڕێوەبەر شتێکی نوێی فێر دەکات ئەو بە دەم هەوڵەکەی ناچێت و حەزی لەوە نیە فێری ببێت، بەم هۆیەوە پێگەی خۆی لەلایەن بەڕێوەبەرەکەی لە دەست دەدات کە هەردەم لە خەمی ئەوەدایە کە ئەو کەسانەی لەگەڵی کار دەکەن مەشق بدرێن و بەرەو پێش بچن، بۆیە ئەو کارمەندەی بەردەوام ئامادەیی خۆی نیشان دەدات بۆ فێربوونی زانیاری نوێ، هەروەها لە هەوڵی پێشکەوتندایە لە بواری کارەکەی پێگەیەکی بەرز و خۆشەویستی و ڕێزێکی تایبەتی لای بەڕێوەبەری کارەکەی دەبێت و دەزانێت کە کەسی شیاوی لە شوێنی شیاو داناوە.



قومریە بەرزنجی

ئەڵقەی یەکەم

# ڕۆڵی مامۆستا لە پێگەیاندنی قوتابیاندا!

بەهای راستەقینەی مرۆڤ لەوەدایە هەموو توانا عەقلی و فیکری و جەستەییەکانی وەگەڕ بخات بۆ بەرجەستە کردنی توانا مرۆییەکان کە بە فاکتەری سەرەکی گەشەکردنی تاك و کومەلگە لە قەڵەم ئەدرێن، بە شێوەیەك هەرکاتێك ویستی زیادی کرد، گەشەی هەمەلایەنەی مروڤ وکۆمەلگە ڕوو لە زیاد بوون دەکەن، ڕوون وئاشکریە کە گەشەکردن وپێشکەوتن هیچ کات لە فەوزاو ئالۆزی و بێ سەرو بەریدا بەدی نایەت، بیرمەندانی هاوچەرخ بەم شێوەیە ئاماژە بە کلیلی گەشەو ئاوەدانی دەکەن.

پێناسەی گەشەپێدانی مرۆیی

کردارێکی گۆڕانکاری و گەشەکردن و بەرەو پێش چونە بە پێی توانا بەرەو باش و باشتر و باشترین، وە بەردەوام و گشتگیرە لە بەکارهێنانی توانا مادی و مەعنەویەکانی بۆ گەشتن بە ئامانجێکی بالاَ.

بە پێی ئەو پێناسەیەی سەرەوە گەشەکردن ئەم تایبەتمەندییانەی هەیە :

١- گۆڕانکاری و بەرەوپێشچون لەسەر ئاستی تاك

٢- گۆڕانکاری و بەرەوپێشچون لەسەر ئاستی کۆمەلگە

گۆڕانکاری پێویستە هەومووچین و توێژەکانی کۆمەلگە بگرێتەوەو لە سەرجەم بوارو بابەتەکاندا بیچێت بۆ ئەوەی کە گەشەکردنێکی گشتی و گشتگیر بێتەئاراوە.

بەردەوامی - گشتگیری

٣- بەردەوامی: کە فاکتەرێکی زۆر گرنگە بۆ گەشە کردن و سەرکەوتن و گەیشتن بە ئامانج چونکە مروڤ بۆ ئامانجێکی پیرۆز بەدی هاتووە.

٤- گشتگیری: پێویستە مرۆڤ بە هەموو توانا مادی مەعنەوییەکانی بەشدار بێت لە گۆنکارییەکان و ببێتە بەشیك لەو گۆڕانکارییانە چەقبەستوو نەبێت .

فاکتەرە گشتیەکانی کانی گەشەپێدانی مرۆیی:

١- مرۆڤ پێویستە خولیاو ئامادەگیەکی بەردەوام و کارای هەبێت لە پێناوی ئەنجامدانی گۆڕانکاری بەردەوام،گەشەکردن پێویستی بە توانایەکی مرۆیی بەهێز هەیە بە بایگراوەندێکی هۆشیاری و مەعریفی زۆروە.

٢- بیری بەهیزو خاوەن ڕۆشنبیرییەکی دەولەمەند :ئەو گەلەی کە کەسایەتیەکان و شتەکانی لە دەست ئەدات بەلاَم شارستانیەت و بیری پارێزراو دەبێت و ئەمێنێتەوە،دەتوانێت سەر لە نوێ دەست پێبکاتەوەو بالاَبکات و گەشەبکات چونکە بیرو هزرو رۆشنبیری ریشەی بە ناخی شارستانیەتەکەیدا ڕۆچووەو هێزی مانەوەو نەفەوتانی پێبەخشیووە.

٣- پاراستنی ڕەوشت وە ك بنەمایەکی بەهێزی گەشەکردن .

٤- بە باشترین شێواز بەکارهێنانی توانا مادی و مرۆییەکان و سەرچاوە سروشتیەکان.

٥- پابەندبوون بە رێکاری زانستی وگرنگترین شێوازی گەشەپێدانی بەرهەمهێنان.

٦- پاراستنی سامانی گشتی کۆمەلگە

٧- دادپەروەری لە دابەشکردندا.

٨- گەشەپێدانی تاك کە لە پەروەردەی فیکری و ڕەوشتیەوە دە سپێدەکات ئەوجا رێنوێنی دەکات بۆ لایەنەکانی ترو دامەزراندنی دامودەزگاکانی تری کۆمەلاَیەتی. کە گرنگترینیان دەزگای پێگەیاندنی نەوەی نوێیە لە پرۆسەی پەروەردەو فیرکردن

بە ها مرۆییەکانی پەیوەست بە گەشە کردن

١- ئـەو بەهایانەی هاندەرن بۆ گەشـە کردن و بەرەو پێشـچون :وەك بەهای کارو پارێزگاری داهات ڕێگری لەزیادە مەسرەف و بە فیرۆدانی بەرهەمەکان .

٢ - ئـەو بەهایانـەی کـە پاڵنـەرن بۆ بەردەوامی وگەشەکردن و بەرەو پێش چوون وەك: توانای مرۆیی و زانسـت و ئامانج لە فێربوونی.

٣ - ئەو بەهایانەی بوار دەرەخسێنن و رێخۆشکەرن بۆ گەشـەپێدان و بەرەو پێش چـوون وەك: بەهای دادگـەری کۆمەڵایەتی و یەکرێـزی و پێویسـتی یەکبـوون و یەکگرتوویی تاکەکانی کۆمەڵگە.

سـەرجەم ئـەو بەهایانـە بەدیهێنەرو پارێزگاریکەری ژینگەیەکی لەبارن بۆ گەشە پێدانی مرۆیی.

ئامانجەکانی گەشەپێدانی مرۆیی

١-ئامانجی ئابوری :بەکارهێنانی بەرهەم و سـەرچاوە سروشـتیەکان بەمەبەسـتی ژیانێکی ئاسودە بۆ تاکەکانی کۆمەڵگە.

٢- ئامانجـی مرۆیـی :ئـەم ئامانجە بە یەکێـك لە ئامانجـە بنەڕەتیەکان لە قەڵەم ئەدرێت لە پرۆسـەی گەشە پێدانی مرۆیی کەبریتییە لە بڵاوکردنـەوەو بایەخدان بە بەها مرۆییەکانی وەك .مەعریفەو ئاشـتی و پەروەردە ودادپەروەری.

٣– فێرکردن: بە گرنگترینی ئامانجەکان دەژمێردرێـت کەئامانجـی بەرزکردنەوەی ئاسـتی هۆشـیاری و مەعریفـی تاکەکانی کۆمەڵگـەو ئاگادارکردنەوەیانە لە بەرانبەر پـرس و بابەتـە مەترسـیدارەکانی وەك نەخوێنـدەواری و هـەژاری و بێئاگایـی لە دەوروبەرو جیهان،بـە تایبەتی لەم زەمەنی جیهانگیرییە رۆشـنبیری و فرە رەهەندەی کە مەترسی بۆ سەر کلتوورو داب و نەریتی وڵاتان و سلوکی تاکەکانیانی دروست کردووە.

٤- پشـت بەخۆبەسـتن، یەکێـك لـە ئامانجەکانی گەشـەپێدانی مرۆیی راهێنانی تاکە کە پشت بە تواناکانی خۆی ببەستێت و خۆی دوور بگرێ لە هەرشێوە چاولێکەریەکی نەرێنی، پێویسـتە سوود وەربگرتن لە توانا زاتییـەکان. بەوپێیـەش دەبێتـە تاکێکـی بەرهەمهێن بۆ کۆمەڵگەکەی.

# پەیڤێك سەبارەت بە هاورێیەتی!




ئایا تا ئێستا ئەو پرسیارەت لەخۆت کردووە، هاوڕێی باش کامەیە، سیفەتەکانی کامانەن،خۆت توانیوتە ببیتە هاورێیەکی باش ؟

بێگومان هەریەك لە ئێمە بەلای کەمەوە هاورێیەك یان زیاترمان هەیە، بەڵام زۆرجار کەسێ لەوکەسانە هەڵدەبژێرین کە سیفەتی هاوڕێیی راستەقینەیان تێدایە، وەك دەڵێن کەسی تەنگانەیە.

جوانی و سیفەتی هاورێیەکی راستەقینە لەنێوان تۆ و هاوڕێکەتدا وەك ئاوێنەیە، چونکە ئاوێنە بە شێوەیەکی راست و بێ درۆ وێنەکان وەك خۆی نیشان دەدا.

واتە ئەو سیفەتەی لەتۆدا هەیە لە هاوڕێکەتدا بەدیت کرد، واتە تۆ خاوەنی سامانێکی بەنرخی کە ئەویش هاوڕێی راستەقینەیە، رەنگە زۆرشت لەژیانماندا بۆ ماوەیەك بن و کۆن بن،بەڵام هاورێیەتی پاك بـەردەوام بەشێکی گرنگی ژیانمانە، وە بۆ مانەوەشی پێویستمان بە (رێز، وەفا، متمانە، خۆشەویستی، راستگۆیی) دەبێت.

چۆن دەبیتە هاورێیەکی باش:

١- سەرەتا هاوڕێیەتی کەسێك بکە کە سودی بۆ ژیانی دونیا و دوا رۆژت هەبێ، کەسێك بێت کە نزیکت بکاتەوە لەخواو رێبازەکەی،نەبێتە هۆی لاواز بوونی ئیمانت پێغەمبەر درودی خوای لێبێت فەرمویەتی: (مرۆڤ لەسەر دینی هاوڕێکەیەتی)

٢- هەمیشە بەشداربە لە ساتە خۆشەکانی هاوڕێکەتدا.

٣- لەکاتی ناخۆشی و کێشەکانیدا پشت و پەنای بەو یارمەتی بدە.

٤- ئەگەر گوزەرانی ژیانت لەهاوڕێکەت باشتر بوو، ئەوا ئەوە مەکە بە پێوێوەرێك بۆ هاوڕێیەتیتان، چونکە وەك دەزانین لەم رۆژگارەی ئێستاماندا سەروەت و سامان لای هەندێك کەس لە زۆر شتی دونیا بەنرخترە، وە ئەگەر هاوڕێکەت گوزەرانی ژیانی لە تۆ باشتر بوو با هاوڕێکەتیەکەت بۆ بەدەستهێنانی ماڵ و سامانی ئەو نەبێت.

٥- هەمیشە هاوکاری مادی و مەعنەوی یەکتر بکەن لەکاتی پێویستدا، ئەمەش هۆکارێکە بۆ لەیەك تێگەیشتنی زیاتر و زیاتر پتەوبوونی پەیوەندیەکان.

٦- هەڵە بچوك و لاوازەکانی یەکتر قبوڵ بکەن و بە لێبوردەیی و سنگ فراوانی چارەی بکەن.

وەرگێڕانی: ئەمیر ئەحمەد عەبدولقادر

ئەڵقەی یەکەم

# 10 دەروازەکانی سەرکەوتن

١. بۆچی هەندێ کەس زیاتر لە کەسانی تر سەردەکەون؟

٢. بۆچی هەندێ کەس بەهرەو زانیاری تەواویان هەیە بۆ سەرکەوتن؟ و لە گەڵ ئەوەشدا لە ئاستێکی گوزەرانی کەمتر ژیان بەسەر دەبەن لە وەی کە لە توانایاندایە تیادا بژین.

وەڵامەکەی پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەك بوو لە لایەن دکتۆرێکی پسپۆر لە زانستی کارگێڕی و کڕین و فرۆشتن و شتی تر، و ئامادەبوون لە زۆر ئەڵقەی خوێندن و خوێندنەوەی هەزاران کتێب.

بە تێ ڕوانینی دکتۆر وەڵامەکە لە شێوەی دە دەروازەدایە لە چوار چێوەی کتێبێك کە ناوی ناوە: دە دەروازەکانی سەرکەوتن، کە لە ساڵی ١٩٩٩ بڵاوی کردبۆوە و نەم بینیوە تەنها ماوەی چەند مانگێك لە مەوبەر نەبێت لە بەشی کتێبی بازاڕی کارفور لە دوبەی —بەداوای لێبوردنەوە!

دەروازەی یەکەم: پاڵنەرەکان کە وەك بزوێنەر وان بۆ ڕفتاری مرۆڤ.

گەنجێك ڕۆیشت بۆ ئەوەی دانایی لە حەکیمێکی چینی یەوە فێربێ پرسیاری لێ کرد نهێنی سەرکەوتن چی یە، ڕێنمایی کرد کە پاڵنەرکانن، هاوڕێ کەمان داوای ڕاڤەکردنی زیاتری کرد،حەکیمەکە سەری گەنجەکەی گرت و نقومی ناو ئاوی کرد، کە ماوەی چەند چرکەیەك جوڵەی نەکرد، ئینجا ئەو دەستی بە هەوڵدان کرد بۆ هێنانە دەرەوەی سەری لە ناو ئاوەکە، ئینجا دەستی کرد بە بەرگری کردنی دەستی حەکیم بۆ ئەوەی سەری دەر بێنێ، ئینجا بە هەموو هێزی خۆی هەوڵی دا تاکو ژیانی لە خنکان لە دەریای حیکمەت رزگار بکات،و لە کۆتایی دا سەرکەوت.

لە سەرتادا پاڵنەرکانی هەبوون بەڵام بەس نەبوون، دوای ئەوە پاڵنەرەکان زیاتر بوون بەڵام نەگیشتنە ئەو پەڕی، ئینجا لە کۆتایدا گەیشتنە قۆناغی شپرزەبوون کلپەگرتن، دەستی حەکیم تەنها لە ڕێگەی ئەم پاڵنەرە بەهێزانەوە لادرا. هەر کەسێك ئارەزوویەکی گڕگرتووی هەبێ بۆ سەرکەوتن بێ گومان سەردەکەوی، وە ئەمەش دەسپێکی ڕێگای سەرکەوتنە.

** دەروازەی دووەم: ئەو توانایەی کە سوتەمەنی ژیانە **



ژیری ساغ و تەندروست پێویستی بە جەستەی ساغ هەیە، و بێ گومان دەبێ ئاستی هەردووکیان بەرز بکرێتەوە بۆ ئەوەی ژیانێکی ساغ و تەندروست بژین.

باشترین دەسپێك ئەوەیە دزەکانی توانای پێویستی ژیانمان دیاری بکەین ئێمەی ئادمیزاد، یەکەمیان پرۆسەی خودی هەرس کردنە، کە داوا دەکات لە خوێن – هۆکاری گواستنەوەی ووزە بۆ هەموو جەستە – کە لە ٪۸۰ ی بە ئاراستەی گەدە بڕوات کاتێك پڕ دەبێ لە خواردن، درودی خوای گەورە لە سەر ئەو کەسە بێت کە فەرموویەتی برسی بن تەندروست دەبن، نیگەرانی دەروونی دووەمین دزی ووزە توانایە،کە هۆکاری هەست کردنە بە لاوازی ،و سێ یەمیشیان هەوڵی زیادەیە بێ پشوو. ئێستا چۆن ئاستەکانی توانا لای هەر یەکێکمان بەرز بکەینەوە – لە سەر ئاستی جەستەیی و ژیری دەروونی؟ وەرزش و ڕاهێنان ، ئینجا نووسینەوەی ئامانجەکانی ژیان لای هەر یەکێکمان، و پێداچوونەوەی ڕۆژانە بۆ ئەوەی بزانین چیمان بەجێ هێناوە ، ئینجا لە کۆتایی دا بە تەنهایی لە شوێنێکی خۆش دانیشی بۆ ئەوەی ووچانێك بدەی بە دەروونت بە ئارامی و هاوسەنگی.

**دەروازەی سێ هەم: شارەزایی کە باغ و بێستانی دانایی یە**

لە لیستی چاککردنەوەی مەکینەیەك هاتووە کە نرخی بزماری خراپ یەك دۆلارە و زانینی شوێنی ئەو بزمارە تێچوونەکەی ۹۹۹ دۆلارە .

هەندێك پێ یان وایە سەرکەوتن بە شانس و ڕێکەوتە، و ئەو کەسانە سەرکەوتن ناناسن ئەگەر بێتە بەر دەمیشیان .

ناسین بریتی یە لە هێز، و بەو ڕادەیەی زانست و زانیاریت هەیە بە هێزو داهێنەر دەبێت و ئینجا سەرکەوتن بە دەست دێنێ.

بەم دوایی یە چەند کتێبێکت خوێندۆتەوە و گوێت لە چەند کاسێتی فێرکاری گرتووە؟ وە ماوەی چەند لە بەردەم تەلەفزیۆن دادەنیشی ؟یەکێك کە ئامادەی کۆڕێکی دکتۆر بوبو سکاڵای کرد کە لە کارەکەی دەرکراوە لە چێشتخانە کاری دەکرد،پرسیاری لێ کرد ئاخۆ هیچ بابەتێکی خوێندۆتەوە بۆ ئەوەی بتوانی لە چێشتخانە کار بکات ، لە وەڵامدا گوتی کارکردن لە چێشتخانە پێویستی بە خویندنەوە نی یە ، ئەم نەفامیە ئەرکەکەی لە دەست دا .بۆ ئەوەی بگەیتە بەیانیەکی باشتر و دوارۆژێکی پرشنگدار زیاتر شت فێر بە بێ وەستان، ئەو وتە نەستەقە چینی یەت لە بیر بێ کە دەڵێ: خوێندنەوە بۆ ئەقڵ وەکو وەرزش وایە بۆ لاشە.

لێرەدا پێم خۆشە زانیاریەکی زمانەوانی باس بکەم ، ئەویش مانای وشەی شانس یان بەخت لە زمانی عەرەبی، کو وەرگێڕاوی ووشەی LUCK ی ئینگلیزی یە – ئەمەش وەرگێڕانێکی ناتەواوە، چونکە پێناسەی سانش لە عەرەبی دا بریتی یە لە نەسیب، لە قورئاندا ئەم ئایەتە هاتووە: (و ما يلقاها إلا الذين صبروا، و ما يلقاها إلا ذو حظ عظيم ) وە لە زمانەوانیدا دەگوترێ فلان کەس شانسی لە هێزدا هەیە، وە فلان ئافرەت لە جوانیدا بەختی هەیە، هەموو ئەمانەش مانای نسیب و قەدەرە، ئاخۆ باپیرانی عەرەبمان نەیانزانیوە – یاخود بڵێ دانی پێدانانێن – لە سەر ئەوە ڕێککەوتوون کە ئەمرۆ شانس مانای چییە؟

**دەروازەی چوارەم: وێناکردن – هێنانە خەیاڵ- ڕێبازتە بەرەو سەرکەوتن**

دەسکەوت و سەرکەوتنەکانی ئەورۆ خەون و ئاواتەکانی دوێنی یە ، هێنانە خەیاڵ سەرەتای داهێنانە، و ئەو گرنگترە لە خودی مەعریفەت ، و هەر ئەوە ئەو جیهانە پێك دێنێ کە تیایدا دەژین . زۆر لە خەونەکان مایەی گاڵتەجاری جیهان بوون بەر لە هاتنەدی یان، وەکو خەونەکەی فرید سمیپ دامەزرێنەری فیدرال (کسبریسن) و خەونی والت دیزنی کە شەش جار مایە پوچی کرد تا هاتەدی .هەموو شتێك یەکەم جار لە ناو ئەقڵدا ڕوودەدات، بۆیە کە خۆت دەبینی سەرکەوتووی و دەتوانێ ئامانجەکانت بهێنێتەدی و لە دڵەوە باوەڕت بەمە هەیە ،هەموو ئەمانە هێزێکی ناوخۆیی دروست دەکات کە ئەم خەونە دێنێتەدی.

هەندێ بیرۆکەی مەزن دەمرن بەر لەوەی لە دایك بن لەبەر دوو هۆکار: نەبوونی باوەڕێکی ناوخۆ، و ڕێگری کردنی کەسانی دەوروبەرمان، تەنها شوێنێك کە خەونەکانت تیادا ئەستەم بێ لە ناوخۆی خۆت دایە.

**دەروازەی پێنجەم: کردەوە (جێ بەجێ کردنی ئەوەی فێری بوویت) ڕێگایە بەرەو هێز**

بە تەنها زانین بەس نی یە، بێ گومان پێویستە ئەنجامدانی کرداری لە گەڵدا بێت و بە تەنها ئامادە باشی بەس نی یە، بێگومان دەبێت ئیش و کار بکرێت، بەڵکو زانینی بێ جێبەجێ کردن لەوانەیە سەر ئەنجامەکەی شکست هێنان و لە ناوچوون بێت.دانایی ئەوەیە بزانی چی دەکەی، و شارەزایی یش ئەوەیە بزانی چون ئەنجامی دەدەی، و سەرکەوتنیش بریتی یە لە ئەنجامدتنی کارەکە! مرۆڤی ئاسایی ٪۱۰ یان کەمتر لەوەی گوێ بیستی دەبێ بیری دەکەوێتەوە، و ٪۲۵ ی ئەوەی دەیبێنێ، و ٪۹۰ ی ئەوەی ئەنجامی دەدات، خاوەن سەرکەوتنەکان هەمیشە ئامۆژگاریمان دەکەن مادام ڕازین بەو بیرۆکەیەی لە مێشکماندایە پێویستە دەسبەجێ جێبەجێی بکەین.

لەمپەڕەکانی خەڵکی بۆ جوڵانەوە لە دوو شت بەدەر نین:ترس (لە شکست هێنان یان لە پەسەندنەبوونی گۆڕان یان لە نادیار یاخود ترس لە خودی سەرکەوتن!) و درێژەپێدان و بیانووهێنانەوە و دواخستن.

چارەسەری ئەم کیشەیە بریتی یە لە هێنانی خەیاڵی خراپترین شت کە ڕەنگە ڕووبدات، وە باشترین شتێك کە ڕەنگە ڕوونەدات لە ئەنجامی ئەم گۆڕانکاریە، ئینجا بەراوردکردن لە نێوان ئەم دووانەدا شکست هێنان لە ژیاندا نی یە، بەڵکو شارەزایی بەدەست هێنراو، بڕیاری دروست، پاش شارەزایی دێت کە لە بڕیاری نادروستەوە دێت.

هەرگیز نیگەران مەبە لە شکست هێنان، بەڵکو وا باشترە بۆ تۆ بۆ ئەو دەرفەتانە نیگەران بی کە لە دەستت چوون، کاتێك هەوڵ نادەیت تەنانەت تاقیشیان بکەیتەوە.

حیکمەتێکی ژاپۆنی دەڵێت: ئەگەر تۆ حەوت جار بکەویت جاری هەشتەم بوستە. ژیان جەربەزەیەکی مەترسیدارە یان هەر هیچ نی یە، ڕەفتار نواندنی بێ نەخشە هۆکاری هەموو شکست هێنانێکە. دەتوانی هەندێك پشوو بدەی لێرە بەر لەوەی خویندنەوە تەواو بکەی، هەستە شەرمەزار مەبە؛ دانایی بە بەهاترە لەوەی بە لە بیرچوونەوە بە فیڕۆی بدەی. دوای دابڕانێکی کەم دەگەڕێینەوە لە گەڵمان بمێنەوە!



ئەڵقەی یەکەم

ئا: کامران عبدالرحمن

# زەنگی بەهرە

## گۆڕان، باوەربەخۆبون، داهینان

کاتێك مـرۆڤ هەست بەبەهرەیەك یا هزرێکی داهێنەرانە، ئەندێشەیەکی ئیلهامدەر دەکات دەبێت هەوڵ بدات رێگەی دەربڕین و هێنانەدی بۆبدۆزێتەوەوکۆسپ وڕێگری لەپێشدا ڕابماڵێت وسەربەست بـڕوات و ڕێگەی خۆڕسکی ئاسایی خۆی بگرێتەبەر، خۆڕسکانەوسروشتیانە.

هەنگاوبەهەنگاو بێ ئـەوەی پەلەی لێبکرێت گەشەبکات،هەربەهرەوتوانایەك کەسەرهەڵدەدات پێویستەئازادبێت لەفۆرم و ڕوو وەرگرتن و گەشەکردندا،گرنگیش نـیـە چ فـۆرم وڕوویـــك وەردەگــرێ یاهەرشێوەیەك یارێگایەك وەردەگـرێ وەگـرنـگ نیەچەند دەخـایـەنـێ وکـەی لـەنـگـەردەگـرێت بەڵکوگرینگ ئەوەیە ئەوداهێنانە لەناخدا نەمرێت وبتواندرێت گوزارشتی لێوەبکرێت.

ئـاڵـوگـۆڕێـك کـەلـەژیـانـی ئـێـوەدا ڕوودەدات،ئاڕاستەی ژیانتان دابین ناکات، بەڵکو ئەو بۆچونەی ئێوەیە لەگەڵ ئەم ئاڵوگۆڕەدا دواڕۆژی ئێوەمسۆگەردەکات. ئـێـمـە هـەمـوومـان وەك بەلەمێکین لەناوەراستی دەریایەکدا،ئەوە ئاراستەی با نیە کەمەبەستی ئێمەدەستنیشان دەکات،لەم بۆچونەدا هەرکەس دەتوانێت بەقازانجی خـۆی ئـاڕاسـتـەی ژیـانـی هەڵبژێرێت یادەست نیشانی بکات،باکان بۆهەمووموان بەشێوەیەکی یەکسان هـەڵـدەکـەن بای مـووشـەکـەکـان، بـای دەرفـەتـەکـان،بـای ئاڵوگۆرەکان، بای ڕەزامەندی،نارەزامەندی بەبەردەوامی دەگەشێتەوە هەروەها بای ئـابـوری بـای سیاسی.. بـەڵام تەنهایەك جـیـاوازی هـەیـەئـەویـش ئەوەیە،ئێمە کـەی بـەلـەمـی خـۆمـان بـەرەوکـەنـاری بەختەوەری بـەرێ دەخەین؟ساڵێك!سێ ساڵ!پێنج ساڵ؟!!جیاوازی لەزەمینەی کات وسـات وگەیشتن وڕێکخستنی چارۆکەی بەلەمەکاندایە نەوەك لەهەڵکردنی باکان واتا هەڵکردنی چارۆکەکانی بەلەمی هزری ئێمەیە دواڕۆژمان دیاری دەکات.

مـرۆڤ لەهەر قۆناغێکی ژیاندابێت گەربیەوێت لەدووساڵی داهاتووی یاپێنج ساڵی داهاتووی بگۆڕێت تەنها هەرئەوەندە بەسە بەجۆرێکی دڵخواز بۆ بەدیهێنانی ئاوات و ئامانجەکانی هەوڵبدات.

گـەورەتـریـن گـۆڕان لـەگـۆڕانـکـاری بـچـوك دەســت پـێـدەکـات، دەسـت لەملکردنی گۆڕانکاری بچوك هونەرێکی گەورەیەو هەوێنی گۆڕانکاری گەورەیە، دواجـارگـۆڕانـکـاری گـەورەش کەلەسەر گـۆڕانـکـاری ووردوبـچـوك دروسـت دەبـن گۆڕانکاری پتەو وڕاستەقینەن وتەمەن وکاریگەرییان درێژترە.

تاچەند لەم دونیایەدا ئاگاداری ڕەوتی گۆڕان بین ئەوەندە باشتروخێراتر سوود لەدەسکەوتەکانی ئەوگوڕانە وەردەگرین بـەمـەرجـێـك خـۆمـان کـراوەوشـەفـاف بـیـن و تـاکـە ڕێـگـەش بـۆقـبـوڵ کـردن وپەسەندکردنی گـۆڕان ئەوەیەکەخۆمان پۆزەتیڤانە مامەڵە لـەگـەڵ گـۆڕان دا بکەین، ئـەمـەش بـەوەدەبـێ کەخۆمان هۆشمەندانەپەنجەرەکانی هۆش ودەروون وهەست ونەستمان بۆگۆڕان ئاوالأبکەین، بەئاگابین وکاریگەرانە بەشداری گۆڕان بکەین نەك تەنیا ببین بەبابەت وکەرەستە بۆ گـۆڕان بگرە بەویستی خۆمان ببین بەپاڵەوان وکەسایەتی کاریگەر لەچیرۆکی گۆڕانەکاندا.

بۆئەوەی بەرهەمێکی باشت هەبێ سەرەتا دەبێت خـۆت لەخۆتاگۆڕانکاری دروسـت بکەیت و خوازیاری ئەوەمەبە کەشتەکان ئاسان ببن هەوڵدەخۆت بەتوانا بکەیت

،خوازیار مەبە شتەکان ئاسان ببنەوەوکێشەت نەیەتەڕێ بەڵکوهەوڵدەخۆت قورس وقایم بکەیت ولێزانینی زیاتر پەیدابکەیت!هیچ کات داواکارمەبە ووتووێژەکان کەمتربن یان گیروگرفتەکان چارەسەرنەکەین چونکە تۆبەبێ ئەوشتانە سەرهەڵنادەیت وگەشەناکەیت.

زۆرجار بەشی زۆری خەڵکی هیچ کاتێك لەژیانیاندا هیچ شتێك ڕوونادات، چونکەهیچ کاتێك بەدوای زانستەوەنەبوون. هیچ شارەزاییەکیان بەدەست نەهێناوەکتێبێکیان نەخوێندۆتەوەو هیچ کاتێك ئەرکێکیان نەداوەتەبەر خۆیان سەرلەسیمینارێك بدەن.

بۆیە تێگەیشتن لە ووتوێژەکان و ڕاوێژکردن کلیلی گەشەسەندنی زانست و زانیاری خۆتە. وەتێگەیشتنیش لەفەلسەفەوجەوهەری گۆڕان باشترین ڕێگەیە بۆباوەڕبەخۆهێنان، ئەوانەی کەلەگۆڕان تێدەگەن متمانەیان بەخۆیان هەیە چونکە لەئاڕاستەکردنی ژیانیان تێدەگەن، هەست کردن بەگۆڕان وات لێدەکات هەمووکات بزانیت ژیان بەرەو کام مەبەست کام ئامانج دەڕوات واتا ئاڕاستەکانی ژیان هەمووکات لەپێش چاودان ئەگەرلەڕێگەی خۆیان لابدەن تێدەگەیت کەپێویستت بەگۆڕانێکی ترە کەواتا هیچ بیانویەك نامێنێت بۆباوەڕبەخۆنەبوون.

وەبۆئەوەی گۆڕان بەئەنجام بگەێنیت زۆربەمان واتێدەگەین کەپێویستمان تەنیا بەشارەزایی وزانیارییە لەگەڵ ئەوەی زانیاری وشارەزایی سودبەخشن بۆمرۆڤ بەڵام ئەوەی پێویستت پێیەتی بۆگۆڕان بەر لە هەمووشتێك بتوانین بەدێرێکی فراوان تەماشای ژیان بکەین.

سروشتی جیهان وادەخوازێ هەمووشتێك لەگۆڕاندابێت، هەمووشتێك وهەمووکەسێك گۆڕانی بەسەردادێت، هەربۆیە ئەگەر چەندئامانجێکت دەست نیشان کردووە بۆ داهاتوویەکی دوور لە بیرت بێت کەپێیان دەگەیت لەڕووی تەمەن وهەست وجەستەوە ئەوکەسەی پێشونیت داهاتوتان لەهیچ کوێ یەکدا نەنوسراوەو هیچ یاسایەك دانەنراوە بۆگەیشتن بەئاوات وئامانج، ئەگەروایە دواڕۆژی خۆتان خۆتان دیاری دەکەن کەئەویش دەرفەتە، بەڵام ئەگەر تێنەگەن کەدەتوانن ژیان، دوارۆژ، داهات..... نەگۆڕن، ئەوا هەروەك زۆرینەی خەڵکی بەبێ گۆڕانکاری هەرلەشوێنی خۆتان واق وڕماودەمێننەوە.

بۆیەئەگەر وەك مرۆڤ گەلێك نەڕوانینە بابەتەکان وسەرنج نەدەین بیسەرێکی باش نەبین، دژوارییەکانی قبوڵ نەکەین دڵنیابن دە ساڵی داهاتووش وەك دە ساڵی پێشوتردەبێت دوای شەو ڕۆژ دێت و دواجار پایز و زستان سەرهەڵدەدات وهیچ شتێك ناگۆڕێت.

بۆیەئەگەربمانەوێت بەدەستهاتوەکانمان ئالوگۆڕ بکات، دەبێت پێشتر خۆمان بگۆڕین نەوەك لەسەرەتای دەست بەکاربوونی هەرکارێکدا، هیواداربم سیاسەتی دەوڵەت ویاسای دارایی و بارودۆخی ئابوری بگۆڕێت، یان بەرپرسەکەم دەست ودڵی فراوان بێت تامەزرۆبم هەمووشتێك بگۆڕێت، گومانیش لەوەدانیە کەهەندێ جار هەست بەلایەنی ترسناك و دژواری گۆڕان دەکەین، چونکە واهەست دەکەین بەشێوەیەکی خراپ کاردەکاتەسەرمان، بەڵام ئەمە تەنیا لەحاڵەتێکدا وایە کەخۆمان بەشێوەیەکی خراپ لەگۆشەیەکی تەسکەوە تەماشای گۆڕان بکەین. ئەگەرنا گۆڕان وەکو هەوێن و یاسایەکی بنەڕەتی سروشت هەڵە قبوڵ ناکات، واتاهەردەم چالاکەو لەبەرژەوەندی مرۆڤ ومرۆڤایەتی دایە و بەئاراستەیەکی سوودبەخش دەڕوا.

ئێمە بەگشتی لەگۆڕان دەترسین بەگۆڕان نیگەران دەبین چونکە شێوازێك لەنێودەبات کەپێی ڕاهاتووین، مۆدیلێك ڕەتدەکاتەوە کەپێی ئاشناین، بەڵام ئەوەی کەدێت ئەوشیوازو مۆدیلەیە کەچاوەڕوانی نین، ئەوەی کەزۆرجار نامانەوێ بێ هەردێ و هەردەم هەنگاوێك بەرەوپێشەوەمان دەبات. خۆئەگەر تۆ واهەست بکەیت کەئەوپرۆسەی گۆڕانە تۆ وەکو تاکەکەس بەرەوپێشەوە نابات، یان تووشی نەهامەتی و سەرنەکەوتنت دەکات، ئەواسەرەڕای هەمووشتێك گەشەو شکۆفەی مرۆڤایەتی لەدواوەیە.

کەواتە کەدان بەگۆڕاندادەنێیت چەند چارەسەرێك یان پاڵنەرێك لەبەردەمدایە وەك وتمان گۆران واتا کرانەوەو شەفافیەت بۆیە تەنیائەوانەی کەباوەڕیان بەگۆڕان نیە لەزمانی گۆڕان نازانن، وادەزانن هەمووکات یەك ڕێگەیان لەپێشە یەك دەرگایان لەپێشە ئەگەر داخرا هیچ دەرگایەکی تر نیە، بۆیە ئەوکەسانە بەئەستەم دەتوانن شتێکی تر هەڵبژێرن ، کەلە نەبزی گۆڕان تیگەیشتی تێدەگەی کەتەمەنی لاویەتی خۆی لەخۆیداتەمەنی کەشف وهەڵبژاردنی چەندان پاڵنەروچارەسەری جیاوازو دەیان دەلاقەو پەنجەرەی ڕووناکت لەپێشدادەکریتەوە.

وەنابێت ئەوەشمان لەبیربچێت ڕووبەروبوونەوەی گۆڕان هەروا ئاسان نیە و ئازایەتی و بوێری دەوێ.ئەوئازایەتی و بوێریە پەیوەندی بەبنیاتی جەستەو ماسولکەوە نیە بەڵکو ئەو بوێریە هەست وبۆچونێکە کەلەزەین و ڕۆحەوە سەرچاوە دەگرێت و واتا لەجیهانبینی دیوی داهێنەرانەوە بۆگۆڕان هەڵدەقوڵێت، بەو مانایەی کەدەبێت بیرو فەلسەفەی گۆڕانت پێ قبوڵ بێت و بەگەشیەوە ڕەفتاری لەگەڵدابکەیت ئینجادەبینیت ژیان لەهەموو قۆناغ و وێستگەیەکدا خۆی نوێ دەکاتەوەو لەهەنگاوێکی نوێ دایە، لەڕاستیدا دەبینیت هیچ شتیك نیە ناوی کیشەوگرفت بێ ئەوەی هەیە تەنیا بارودۆخیکی نوێیە کەڕەنگەچاوەڕوان نەکراوبێت یاخود سەدلەسەد پێچەوانەی ویستی تۆبێ یا لەگەل ئارەزوەکانی تۆدا بەهیچ جۆرێك نەگونجێ، هەربۆیەناوی کیشە یان گرفتی لێدەنێین لەبەرئەوەی پێچەوانەی ئارەزی تۆیە بەڵام ئەگەربەقوڵی لەڕوانگەی فەلسەفی گۆڕانەوە تاو وتوێی بکەی بۆت دەردەکەویت کەبارودۆخێکی نوێ هاتۆتەکایەوە کەدەتوانێ پاڵنەرو ڕێگەچارەی بۆبدۆزیتەوە یابیگۆڕێت، هەندێ لەوگۆڕانانەش خۆت دروستیان دەکەیت و هەندێکیشیان لەدەرەوەی ویست وخواستی خۆتن.

## پایان

سەرنووسەر



# خانمان ئەمەیە رۆمانسیەت!

زۆرجار و زۆرکەس لێرە و لەوێ سەرسام دەبن بە ئەتەکێت ونەریتی رۆژئاواییەکان و بەنیشانەی پێشکەوتوویی و شارستانی و شکۆیی ناوزەدی دەکەن، بە تایبەت ئەو باسانەی تایبەتن بەخانمان، بەجۆرێك کاریگەرێتیان لەسەر دروست دەکات و هێندێ جاریش لاسایی دەکەنەوە، بەڵام گەر ئاورێك بدەینەوە و بروانینە ژیانی پێغەمبەری ئازیزمان، (صلی الله علیه وسلم) دەبینین بەراستی ئەو سەرمەشق و پێشەوای هونەری ئەتەکێت و دابونەریتە جوانەکانە، دەبا بروانینە چەند برگەو سەرە باسێك.

١- کاتێ هونەرمەندێکی بیانی لە فلیم و دراماکاندا دەبینرێت، خەریکە پارویەك دەخاتە دەمی خێزانیەوە خەڵکی پێی سەرسام دەبن، بەڵام با سەرسام بن بەم فەرمووده شیرینەی پێغەمبەر (صلی الله علیەوسلم) (إنك لن تنفق نفقة تبتغي بها وجه الله إلا أجرت عليها، حتى ما تجعل في فم امرأتك) رواه البخاري ومسلم

٢- هەندێ وا دەزانن گۆرینەوەی چەپکە گوڵ و بردنی بە دیاری بۆ یەکدی نەریتێکی رۆژئاواییە، بەڵام ئەم فەرموده شیرینەیان لەیاد کردوە کە دەفەرموێت (من عرض عليه ريحان، فلا يرده، فإنه طيب الريح، خفيف المحمل ) رواه مسلم

٣- سەرسام دەبن کە دەبینن پیاوێکی رۆژئاوایی دەرگای ئۆتۆمبیل بۆ خێزانەکەی دەکاتەوە، بەڵام نازانن صەفیەیی هاوسەری پێغەمبەر (صلی الله علیەوسلم) چۆتە سەر ئەژنۆی سەروەرمان تا سواری وڵاخەکەی بێت (وقد روى أنه) (صلى الله عليه وسلم) (وضع ركبته لتضع عليها زوجه صفية رضي الله عنها رجلها حتى تركب على بعيرها) رواه البخاري.

٤- کاتێ پێغەمبەری خوا (صلیَ الله علیەوسلم) لەگەڵ خاتوو عائیشەدا بوو (خوای لێ رازی بێت) گەر ویستبێتی ئاو بخواتەوە ئەوا لەهەمان دەفر کە ئەو ئاوی تێدا خواردۆتەوە و لەجێگا دەمی ئەوەوە ئەمیش ئاوی خواردۆتەوە، هەروەك فەرموویەتی: (كنت أشرب فأناء له النبي (صلى الله عليه وسلم) فيضع فاه على موضع في) رواه مسلم

٥- پرسیاریان لەخاتوو عائیشە کرد پێغەمبەری خوا (صلی الله علیەوسلم) لەماڵەوە چی دەکات فەرمووی (كان يخيط ثوبه ويخصف نعله ويعمل ما يعمل الرجال في بيوتهم) رواه أحمد.

واتە: وەك هەر مرۆڤێکی تر، کراسەکەی دەدورێتەوە، پێڵاوەکەی چاك دەکات، خزمەتی خۆی و ماڵەکەی دەکات.

لە ئەتەکێتی رۆژئاوادا هاتووە، خۆت خزمەتی خۆت بکە، بەڵام سەروەرمان پێش چەندین سەدە پێش ئەوان بەکردار سەرمەشقی ئەم کاروانە بووە، لەمیانەی ئەم چەند دەقەی کە ئاماژەمان پێ دا دەبینین سۆز و رێز و خۆشەویستی و رۆمانسیەتی راستەقینە تەنها لەنێو بەرنامەو پەیامی پەروەردگاردایە، ئەوانی دی روکەش و فریودەرن.